چاپی یەکەم

ئەدهەم شەرقاوی

# دەگێڕنەوە

کۆمەڵە چیرۆکێکی کورت و بڕمانا



وەرگێڕانی: یاسین مەحمود تاوگۆزی

238 posts | 19.2k followers | 7 following

Promote | Edit Profile

پەڕەی فەرمی 📚 کتێبی PDF 📚

Public Figure

لێرە

باشترین و بەسودترین و پڕ خوێنەرترین کتێبەکان

بە خۆڕایی و بە شێوەی PDF داگرە

.

Ganjyna

.

لینکی کتێبەکان 👇 ئەم لینکە بکەرەوە بۆ داگرتنی کتێبەکان

drive.google.com/folderview?id=1gk8e3nSJGJLu36xeLUjwdbjgTSVsIbo_

Ktebi_PDF



# دەگێڕنەوە

## کۆمەڵە چیرۆکێکی کورت و پڕمانا

نوسینی: ئەدهەم شەرقاوی

وەرگێڕانی: یاسین محمود تاوگۆزی

# دەگێڕنەوە


- ❖ ناوی نووسەر: ئەدهەم شەرقاوی
- ❖ ناوی وەرگێڕ: یاسین محمود تاوگۆزی
- ❖ دیزاین: ناوەندی ڕێنوێن
- ❖ تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- ❖ نۆبەی چاپ: یەکەم ٢٠١٩
- ❖ قیاس: ١٤ بە ٢١

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٥٨٢)ی ساڵی ٢٠١٩ ی پێدراوە

RENWEN

ناوەندی ڕێنوێن

0751 140 8868 - 0750 126 9689

hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com

سلێمانی - بازاڕی ئاوباریك - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە ( ٦٦ )

# ناوەڕۆك

( فَاقْصُصِ الْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ) الأعراف ١٧٦

**واتە: ئەی موحەمەد ئەم چیرۆك و بەسەرهاتانەیان بۆ بگێڕەرەوە بەڵكو بیریك بكەنەوەو بەخۆیاندا بچنەوە**

خوێنەری بەڕێز: هەندێک وشەی ڕەسەنی کوردی لەم ناو ئەم کتێبەدا هەیە، لەبەر کەم بەکارهێنانیان ڕەنگە واتای ئەو وشانە لای هەندێک کەس ڕون نەبن؛ هەر بۆیە ئەم فەرهەنگۆکەم لێرە دانا بۆ ئەوەی خوێنەر لە کاتی پێویستدا بۆی بگەڕێتەوە

| وشەو واتاکەی | وشەو واتاکەی |
| --- | --- |
| **ئاچوخ:** کراوە، ئاوەڵا ، واز، گوشاد | **جلفی:** شێوە زاری دوور لە ڕێساو بنەماکانی پاراوی. |
| **ئاریشە:** گرفت، موشکیلە | **جڵەو:** هەوسار، ڕەشمە، قامچی لغاو |
| **ئاشتەبا:** شت | **چارەوێ:** وڵاخی سواری و باری |
| **ئاوزەنگی:** دوو ئاسنە بەڕاست و چەپی زینەوە سوار پێی تێدەخات | **حەکیم:** پزیشکی سوننەتی |
| **ئەرخەیان:** بێ خەم، دڵنیا | **خاترجەم:** دڵنیا، بێخەم |
| **ئەزەڵ:** پێشینەترین، هەربوو | **خەڵتان:** گەوزان، تێوەچوون |
| **ئۆغر:** ڕۆیشتن، سەفەر | **داسەکنین:** سرەوتن، ئۆقرە گرتن |
| **بانگگە:** منارە | **دەستەوسان:** ناچار، بێ عیلاج، مەحتەل ماو |
| **بڕست:** وزە، هێز، توانا | **دەبەنگ:** گێل، نەفام |
| **بنکڵیشەچوون:** هاندان و فریودان | **ڕام:** کەوی، فێر، خوگرتو |
| **بەرک:** گیرفان | **ڕژد:** ڕەزیل، چروک، دەست قوچاو |
| **بەلەسە بوون:** هەڵهاتن بۆ دەشت و دەر | **ڕوتەن:** ڕوتاڵ، زەوییەک کە گیای لێ نەڕوابێ |
| **باڵەکۆن:** پێش هەیوان | **ڕەت بردن:** تەکانخواردنی لەپڕ، هەڵەنگوتن |
| **بێگار:** کاری زۆرەکی و بەخۆڕایی | **ڕەشۆکی:** شتی بەدەڵ و کەم نرخ |
| **پلوسک:** شتێکی بۆشە چۆڕاوگەی ئاوی سەربانی پێدا دێتە خوارەوە | |

**پەژموردە:** سیس و لەگەشەکەوتوو

**پەسن:** تاریف، پیاهەڵگوتن، چاکە وتن

**پۆزش:** داوای لێ بوردن، بیانوی بەجێ

**تژی:** پڕ، لێوانلێو

**تەیار:** سازو ئامادە بۆ کار یان بۆ گەشت

**تویشو:** خواردن بۆ ڕێگای دوور

**جامباز:** دەستبڕو فێڵباز

**قەباحەت:** کاری خراپی ئابڕووبەر

**قەرەقوشی:** حوکمی دیکتاتۆری

**قولینە:** قەرتاڵە، سەبەتە

**قۆقز:** زەق، زۆپ، دەرپەڕیو

**گەرماو:** حەمام

**گرمۆڵە:** لول بوون، لەدەوری یەک ئالان،

**کۆش:** بریتیە لە ژمارەیەکی زۆر (کۆشێک منداڵی هەیە)

**کاکی بەکاکی:** دەشتی تەخت و پان و بەرین

**کڵۆم:** داخستنی دەرگا

**کۆڵیت:** کوخ

**کەسەر:** خەم و خەفەت

**کەنەفت:** کەلەلا، زۆر حاڵ پەرێشان

**کەودەن:** نازیرەک

**ساخلەم:** تەندروست

**سرتوخورت:** چپەچپ

**سەراسیمە:** سەرگەردان

**سەوداسەر:** گێژو وێژ، قوڕبەسەر

**سیخاخ:** پڕ، ئاخنراو

**شەتەک:** بەستنی توند

**عەیام:** ڕۆژگار، زەمان

**غەوارە:** بێگانە، غەریبە

**قامچی:** شەلاق

**قوشقی:** تورە، وەڕەز

**مست، مشت**

**ملوموش:** گەڕان و بۆن کردنی زەوی

**مەدهۆش:** سەرسام، واقوڕماو

**مەرکانە:** دەفرێکی گڵینی سورەوەکراوی قوڵی دەم زلە

**مێرگ:** چیمەن، گیاجاڕ

**واز:** ئاوەڵا، کراوە

**ورک:** پەڵپ، گرو

**هەرۆ:** برۆ

# بەناوی خوای گەورە

## پێشەکی

خوێنەری سەنگین: ئەم نامیلکەیەی بەردەستت بریتییە لە کۆمەڵە چیرۆکێکی کورت بەڵام لێوانلێو لە وانەو پەندو ئامۆژگاری بەپێز کە نوسەری قەڵەم ڕەوانی فەلەستینی ئەدهەم شەرقاوی وەستایانەو بەزمانێکی تەڕو پاراو دایڕشتووەتەوە، کاتێک بە ناو کتێبەکانی ئەم نوسەرە بەتوانایەدا گوزەرێکم کرد ئەم کتێبەی سەرنجی ڕاکێشام و چاوێکی خێرام پێدا خشان، بۆم دەرکەوت ئەگەرچی کتێبەکە لەڕوی قەبارەوە زۆر گەورە نیە بەڵام لە ناواخندا گەلێک مەزنە؛ بۆیە پێم خۆش بوو خوێنەرانی کورد زمانیش لەم بەرهەمە ناوازەو چێژ بەخشە بێ بەش نەبن، ناوی خودام لێهێناو وەرمگێڕایە سەر زمانی شیرینی کوردی.

ئێمە ئەگەر چاوێکی خێرا بە قورئانی پیرۆزو فەرمودە شیرینەکانی حەزرەتدا بگێڕین ئەوا دەبینین چیرۆک ئامادەگییەکی بەرفروانی هەیەو ڕووبەرێکی یەکجار مەزنی داگیر کردووە، ئەمەش بۆ ئەو کاریگەرییە ڕاستەخۆو بەهێزە دەگەڕێتەوە کە چیرۆک لەناخ و هزری مرۆڤەکاندا دروستی دەکات.

گرنگی چیرۆک لەوەدایە لەپاڵ ئەوەی نزیکترین ڕێگایە بۆ گەیشتن بە ئامانجە پەروەردەییەکان هاوکات چێژ بەخش و هەست بزوێنیشە، بەڵام کارەسات لەوەدایە خوێندنەوەو گوێگرتن لە چیرۆکەکان تەنها بۆ کات بەسەر بردن بێت و وانەو پەندو ئامۆژگارییە بەپێزەکانی پشت چیرۆکەکان بەهەند وەرنەگیرێت

ماوەتەوە بڵێم: خۆ ڕەنگە بەشێک لە چیرۆکەکانی ناو ئەم کتێبە ئەفسانە بن و لە زەمینی واقیعدا ڕوویان نەدابێ، بەڵام گومان لەوەدا نیە ئەم جۆرە چیرۆکانە زمانحاڵی واقیع و ڕەنگ دانەوەی ژیانی خەڵکن و بەشێوەی جیاوازو لە بەرگی تردا ڕویانداوە، بۆیە گرنگتر لە هەر شتێکی تر هەڵێنجانی ئەو وانەو ئامۆژگارییانەیە کە چیرۆکەکان لەخۆیان گرتووە.

براتان

یاسین محمود تاوگۆزی

شارەزوور ــ زەڕایەن

٢٦ــ ٥ ــ ٢٠١٩

# پێشەکی

" دەگێڕنەوە " کۆمەڵەچیرۆکێکی کورت و پڕ واتـایە کە پیرەژنێـک بەدوولێـوە نەخوێندەوارەکەی لەدەفتەری یادگەمدا نوسیویێتیەوەو لەگەڵیاندا ژیاوم وگەورەبووم، سەرەتا دوودڵبـووم لە نوسـینەوەو داڕشـتنەوەی ئەم چیرۆکـانە؛ چـونکە چیـرۆکە میللیەکان هەمیشە شێوەزاری جلفی و ناوچەیی بەشێکی دانەبڕاوە لێیـان، دواتـر هاتمەسـەر ئەو بـڕوایەی کە پێویسـتە بە زمـانێکی ڕەوان و پـاراو دابڕێـژرێنەوە؛ چونکە پێم وابوو بەم کـارە ئەم چیرۆکـانە لە زینـدانی سنگ و یادگەمـدا ئـازاد دەکەم و دەیانخەمە ناو گۆڕەپانە بەرین و بەرفراوانەکەی نوسین و خوێندنەوەوە.

کاری من لێرەدا ئەوەندی داڕشتنەوەو قوتار کردنی ئەم چیرۆکانەیە لە فەوتان ئەوەندە نوسینەوەیان نیە، هەندێک شت هەیە ستەمە ئەگەر بە مـوڵکی کەسێک یان خانەوادەیەک تەنانەت گەلێکـیش بمێنێـتەوە، شـتگەلێک هەن وەک هەوا وان هەموو کەسێک مافی پێوەی هەیە، شتگەلێک هەن وەک پرشـنگی خـۆر وان هـیچ کەس بۆی نیە بیکاتە هی خۆی و دەستی بەسەردا بگرێت، ئەم چیرۆکانەش لەم قەوم و قوماشەن!

من لێرەدا دەمەوێت ئێوەش هاوبەش بکەم لە چێژ وەرگرتن لە چیرۆکەکانی نەنکم، بەداخەوەم کە نـاتوانم دەنـگە پـڕ لە هەسـت و سۆزەکەی کە هاوکـات هەناسەی قوڵی لە گەڵدا هەڵدەکێشاو هێندەی تـر چێـژو جـوانی بە چیرۆکەکـان دەبەخشی بدەم بە گوێتاندا ، ئەڵبەت من تەنها بەوە دانەکەوتوم کە چیرۆکەکان لە زمانی جلفی و نـاوچەییەوە بگـوێزمەوە بـۆ زمـانە تەڕو پـاراوەکەی نوسـین و خوێندنەوە، بەڵکو بەم کارانەی لای خوارەوەش هەستاوم:

ڕوداوو ڕێــڕەوەی هەنــدێک لە چیرۆکەکــانم گوڕێــوە کاتێــک زانیبێــتم ئەو گۆڕانکارییە خزمەت بە ناوەڕۆکی چیـرۆکەکە دەکـات و بەرگـی واقیعـی بـوونی بەبەردا دەکات.

ناوی کارەکتەری نـاو چیرۆکەکـانم لابـردووە کە زۆر جـار لە چەنـد نـاوێکی سـنوردارو دووبـارە تێـنەدەپەڕین؛ چـونکە وەک پێشـتر وتـم گرنگتـرین هۆکـاری نوسینەوەی ئەم چیرۆکانە لە دوتوێی کتێبێکدا ئەوەیە کە ئەم چیرۆکانە لە بازنە تەسک و کەسییەکان دەرباز بکەم بۆ بازنەگشتی و بەرفراوانەکە.

هەندێک وشەی نەشیاوو هەڵماڵراوی ناو چیرۆکەکانم سڕیوەتەوە کە بە زۆری ئەم جۆرە وشانە لە ناو چیرۆکە میللیەکاندا بونیان هەیە .

سەبارەت بە چیرۆکی پێغەمبەرانیش هاتوم هەر شـتێک کە نـاکۆک بێـت لە گەڵ ئیسلامدا فرێم داوە؛ چونکە چیرۆکە میللی و دەمـاودەم پێکراوەکـان تـژی و لێوانلێون لە ئەفسانەو ئیسرائیلیاتی پڕوپوچ و بێبەنما، بەڵام ئەگەر شتێک نـاکۆک و دژ نەبێت لەگەڵ شەریعەتی پاکی ئیسلامدا ئەوا وەک خۆی و بەبێ دەسکاری هێشتومەتەوە.

هاتووم هەندێک شوێنی چیرۆکەکانم لە شێوەی پەخشانە شیعردا گێـڕاوەتەوە، هەرچەنـدە چیـرۆکەکە خـۆی بەو زمـانە وێـژەییە نەگێـڕدراوەتەوە، بەڵام خـۆ گێڕانەوەی چیرۆک بەم شێوازە وێژەییە شتێکی نامۆو دژە باو نـیە، بەڵکـو ئەگەر بێین چاوێکی خێرا بە کەلەپـوری ئەدەبیـاتی کۆنـدا بگێـڕین بە ئاسـانی بۆمـان دەردەکەوێت گێڕانەوەی چیرۆک لە شێوەی پەخشـانە شـیعردا شـتێکی ئاسـاییە، بگرە هەمومان خولیاو دڵخوازی ئەوەین برگەکانی ڕستە هەمویـان هاوئاهەنـگ و سەروا ڕێک بن.

گفتوگۆی کارەکتەرەکانی ناو چیرۆکەکانم درێژ کردووەتەوە؛ چونکە لە چیرۆکە میللیەکانـدا حیکـایەتخوان بە ئـارەزوی خـۆی چیـرۆکەکە سـەرقرت و بنقـرت دەکـات، ویسـتم لە پێنـاو دیـالۆگی کەسـایەتییەکانی نـاو چیرۆکەکـان ڕۆڵ و کاریگەری حیکایەت خوان کەم بکەمەوە، ئەمەشم بۆ ئەوە کـرد چیرۆکەکـان لە چەقبەستویی ڕزگار بکەم و جموجوڵی زیاتر بخەمە ناویانەوە.

پێشەکی ئەم کتێبە بە کۆتا گەیشت، بەڵام من هیـواو ئـاواتێکم هەیە بەکۆتـا ناگات، ئەویش ئەوەیە: خزمەتێکم بەم چیرۆکانە کردبێت و نەمشێواندبن.

## " درەختی هیوا و خۆزگەکان "

دەگێڕنەوە دوو برا هەبوون لە گوندێکی خۆش و دڵڕفێندا، یەکێکیان خاوەنی سەروەت و سامانێکی زۆرو بێشومار بوو، لە پاڵیشیدا زۆر ژیرو دانا بوو، بە سامانانەکەی دەستگیرۆیی هەژارانی دەکردوو بە ژیری و زاناییەکەیشی خەڵکانی ناکۆک و ناتەبای پێکدەهێنایەوە؛ بۆیە هەردەم خۆشەویستی ناو خەڵک و جەماوەر بوو.

بەڵام ئەویتریان سەرەڕای هەژاری و دەستکورتییەکەی کەسێکی گەلحۆو ناتێگەیشتویش بوو، هەر ئەم نەزانی و نەفامییەی وای لێکرد ئێرەیی (حەسودی) بەبراکەی ببات و چاو ببڕێتە ماڵەکەی سەرەڕای ئەوەی هەردەم هاوکاری دەکردوو دەستی بەدەمیەوە بوو، هەموو هیواو ئاواتێکی ئەوە بوو خۆی بگەیەنێتە ئاستی براکەی لە پارەو ژیریدا!

ئەم برا چاوچنۆکە شەوێک خەوێک دەبینێت وادەزانێت لە ناو ئەشکەوتێکدایەو بەناویدا دەسوڕێتەوە، لە ناکاو ڕێی لە چرایەک کەوت، دەستی بە چراکەدا هێناو دێوێکی گەورەی لێ هاتە دەرەوەو وتی: ( چی ئەفەرموی بیڵێ قوربان، نۆکەرتم هام لە خزمەتتان، داوا بکە پێت ببەخشم، فەرمان بکە گوێ لە مستم!)

کابرای چاوچنۆکیش یەکسەر وتی: ئەمەوێت وەک براکەم لێ بێت!

دێوەکە وتی: هەرچەندە کاری من بەدیهێنانی هیواو ئاواتەکانە نەک ئامۆژگاری و ڕێنمایی کردن، بەڵام قەیناکا با ئەم ڕێنماییەت پێشکەش بکەم، بچۆ بۆ فلان شوێنی دوورە دەست شاخێکی ڕوتەنی لێیە کە نە ئاوی لێیەو نە گژوگیاو دارودرەختیشی لێ ڕواوە، تەنها تاقە دارێک نەبێت ئەویش لە سەر لوتکەی شاخەکە کە پێی دەڵێن "درختی هیواکان" بەیانی زوو بچۆ خۆتی

پێبگەیەنە، ئەو درەختە بۆ گەیشتن بە حەزو خولیاکانت هەموو ڕێنمای وئامۆژگارییەکت پێشکەش دەکات ، بەیانی کە دنیا بومولێڵ بوو توێشوی ڕێگای پێچایەوەو بەهەڵەداوان بەرەو لای درختەکە ملی ڕێگای گرتەبەر، لە ڕێگادا گەیشتە کەمتیارێک، وتی ها بۆ کوێ ئۆغر دەکەیت، کابرا وتی: ئەچم بۆ لای درەختی هیواکان، هەر داواو پرسیارێکت هەبێ لەوێ وەڵامەکەی وەردەگریت.

کەمتیارەکە وتی: ئەتوانی پیاوەتییەکم لەگەڵدا بکەیت و شەکوای حاڵی منیشی پێ بگەیەنیت؟

کابرای چاوچلێس وتی: وەی بەچاوان بە ئەوپەڕی خۆشحاڵیەوە داواکەت دەگەیەنم.

کەمتیارەکە وتی: لە درەختی هیواکان بۆم بپرسە کە من ڕاوێکی زۆر دەکەم، لە گۆشتی تازەو ناسک دەخۆم لە ئاوی سازگار دەخۆمەوە کەچی هەر لەڕو لاوازم وەک دەبینیت.

کابرا وتی: ئەرخەیانبە

کەمتیارەکەی بەجێهێشت و درێژەی بە گەشتەکەیدا لەم شاخ بۆ ئەو شاخ و لەم دۆڵ بۆ ئەو دۆڵ تا گەیشتە باخ و بێستانێکی گەورە کە خاوەنەکەی خەریکی دروست کردنی پەرژین و شوورە بوو بەدەوری باخەکەیدا، سەلامی لێ کردوو پێکەوە ڕازی قسەیان دامەزراند، باخەوانەکە پرسیاری لێ کرد: ئەرێ ئەتەوێ ئۆغری خێر بۆ کوێ بکەیت، وتی: ئەمەوێت بچم بۆ دیداری درەختی هیواکان، کە هەر پرسیارێکی لێ بکەیت وەڵامت دەداتەوەو ڕێنمایی دروستیشت دەکات.

باخەوانەکە وتی: مەردی خوابە ئەم پیاوەتییە لەگەڵ مندا بکەو پرسیاری ئەم بێستانەی منیشی لێ بکە، شەو ڕۆژ خەریکی خزمەت کردنیم، گژوگیای ناو باخە هەڵدەکێشم و زەوییەکەیشی پاچەکۆڵە دەکەم، درەختەکانی ئەپارێزم و هەڵیاندەپاچم، هەرگیز ناهێڵم تینویان ببێت، کەچی وەک دەبینیت درەختەکان هەموویان پەژموردەو چروساوەو کەمبەرهەمن.

وتی: بێخەمبە سکاڵاکەت دەگەیەنم.

درێژەی بە گەشتەکەی دایەوە، لەم گوند بۆ ئەو گوندو لەم شار بۆ ئەو شار تا ڕێی لە کۆشک و تەلارێکی هەوربڕو ڕازاوە کەوت کە بە چەندین گومبەدی قۆقز ڕازێنرابویەوە، بەڕێکەوت لەو کاتەدا پاشا لەڕاوو شکار دەگەڕایەوە، فەرمانی کرد بە پاسەوانەکانی بزانن ئەم کابرا نەشناسە چ کارەیە، هاتنەوە بۆ لای پاشاو چیرۆکی کابرای حەسودیان بۆ گێڕایەوە: لە کوێوە هاتووە، چۆن هاتووە، بۆ کوێ دەچێت، پاشا فەرمانی کرد بۆیان هێناو دووبەدوو لە گەڵیا دانیشت و پێی وت: ئەتوانی چاکەیەکم لەگەڵدابکەیت و ئەم شکایەتەی منیش بە درەختی هیواکان بگەیەنیت.

کابرا وتی: قوربان ڕۆحم لە ڕێتایەو داوای جەنابتان ڕەت بونەوەی نیە.

پاشا وتی: وەک دەبینیت سەربازەکانم یەکجار زۆرو بێ شومارن، سنوری مەملەکەت و قەڵەم ڕەوییەکەیشم هێندە بەرفراوانە ئەمسەرو ئەو سەری دیار نیە، بەڵام هەرچی ئەکەم سام و هەیبەتم وەک سام و هەیبەتی پاشاکانی تر نیە، لە درەختی هیواکان بۆم بپرسە هۆکاری ئەمە چیە؟!

کابرا وتی: خاترجەمبە قوربان وەڵامت بۆ وەردەگرمەوە.

پاشان خواحافیزی لە پاشا کردو جارێکی تر ملی ڕێگای گرتەوەو درێژەی بە ڕۆیشتنەکەیدا، پێش ئەوەی خۆری ئەو ڕۆژەی لێ ئاوا ببێت خۆی گەیاندە

دامێنی شاخە ڕوتەنەکە، سەرێکی بەرز کردەوە بۆ لوتکەی شاخەکە تەماشا ئەکات تاقە درختێک بەسەر لوتکەی شاخەکەوەیە، ئیتر زانی ئەوە درەختی هیواکانە، بۆیە بەبینین و دۆزینەوەی ئەو درەختەی کە عەیامێک بوو وێڵ و سەوداسەر بوو بەدوایدا هەموو ئەو شەکەتی و ماندوبونەی کە لە ڕێگادا توشی هاتبوو بیری چویەوە، ڕووەو لوتکەی شاخەکە بەخێراییەکی زۆر ملی نا، وەک ئەوەی لە ناو دەشت و ساردا ڕێ بکات، هیچ هەستی بە سەختی چیاکەو تاشەبەردەکانی نەدەکرد تا گەیشتە لای درەختەکە، وتی: سڵاو ئەی درەختی هیواو خۆزگەکان!

درەختەکەش وەڵامی دایەوەو وتی: سلاو لە تۆش ئەی مرۆڤی پشودرێژ

کابرای حەسود وتی: ڕێگایەکی پڕ لە هەورازو نشێوم بڕیوە تا گەیشتمە لای تۆ، کۆمەڵێک پرسیارم لەگەڵ خۆم هێناوە، هەندێکیان هي خۆم و هەندێکی تریان هي خەڵکە.

درەختەکە وتی: لە کوێوە هاتوی بەشوێنی خۆتدا بگەڕێرەوە، لە هەر کوێیەک گەیشتیتەوە بە خاوەن پرسیارەکان لەسەر زمانی تۆ وەڵامیان دەدەمەوە.

کابراش بەبێ سێ و دوو بەشوێنی خۆیدا گەڕایەوە تا گەیشتەوە بە کۆشکی پاشا، داوای مۆڵەتی بینینی پاشای لە پاسەوانانی کۆشک کرد،ئەوانیش وتیان: وا چەند ڕۆژە پاشا لە چاوەڕوانی تۆدایە، بەخێرایی دیداری پاشایان بۆ ڕێکخست، بەڵام وتی: من و پاشا دەبێ دووبەدوو بین و کەسی سێیەم لە نێوانماندا نەبێت.

وتی: جەنابی پاشا تۆ ئافرەتیت، کاتێک پاشای مەملەکەت وەفاتی کرد بازەکە بەسەر سەری تۆوە نیشتەوە، هەر بۆیە خەڵکەکە ملیان بۆ دایت و پێت قایل بوون، تۆش شێوەی خۆتت گۆڕی بەڵام تەبیعەت و سروشتی خۆتت نەگۆڕی!

پاشا وتی: کەس بەم کەینوبەینە نازانێت تۆ نەبێت، وەرە لەگەڵ مندا بمێنەرەوە شوت پێدەکەم و پێکەوە فەرمانڕەوایی ئەم مەملەکەتە دەکەین!

وتی: هەرگیز کاری وا ناکەم، من دەمەوێت خۆم بگەیەنمە ئاستی براکەم و بچمە ڕیزی ئەوەوە!

کۆشکی پاشای بەجێهێشت و چەند ڕۆژێکی تر ڕێگای بڕی تا گەیشتەوە بە باخەوانەکە، تەماشا ئەکات بە تاسەوە چاوەڕوانی گەڕانەوەیەتی، وتی ئەی باخەوان لە ناو باخەکەتدا دار زەیتونێکی پیر هەیە، لە ژێریدا گەنجینەیەکی زێڕ حەشار دراوە، هاوکات مارێک پاسەوانی دەکات، هۆکاری چروساوەیی و کەمبەرهەمی باخەکەت ئەو مارەیە، باخەوانەکەش تەوراسێکی هەڵگرت و چوو بنی دارەکەی هەڵدایەوە، مارەکەی کوشت و گەنجینەکەیشی دەرهێنا، باخەوانەکە بە کابرای حەسودی وت: بۆ نایەیت لێرەدا لەگەڵ مندا بژیت و پێکەوە خزمەتی ئەم باخە بکەین، ئەوەتا ئەبینیت باخەکە زۆر گەورەیەو ئەم پارەیەشمان لەدەستدایە وەک پاشا پێی ئەژین، وتی: هەرگیز شتی وا ناکەم، من کار بۆ ئەوە دەکەم خۆم بگەیەنمە ئاستی براکەم و بچمە ڕیزی ئەوەوە، کابرای باخەوانیشی بەجێهێشت، شیوو دۆڵی زۆری تری بڕی تا بەهەر حاڵێک بوو گەیشتەوە لای کەمتیارەکە، تەماشا ئەکات ئەمیش دەمێکە لە چاوەڕوانیدایە، کابرا هات باسی پاشاو باخەوانەکەی بۆ کرد کەچۆن خوڵکیان کردووەو ئەمیش ملی بۆ نەداون، پاشان وتی ئەی کەمتیار: تۆ نەخۆشیت و چارەسەری نەخۆشییەکەیشت ئەوەیە مرۆڤێکی نەزان و کەودەن بخۆیت.

کەمتیارەکە وتی: شاژن پێشنیاری بۆ کردیت لەگەڵیدا هاوسەرگیری بکەیت ڕەتت کردەوە، باخەوانەکە پێشنیاری بۆ کردیت ببیتە هاوبەشی لە پارەو باخەکەیدا ڕەتت کردەوە، بەخوا ئەگەر هەموو سەر زەوی بگەڕێم لە تۆ نەزانترو دەبەنگترم دەستناکەوێت: بۆیە پەلاماریداو خواردی!

## " قسەو باسی ناو ئاشەکۆنەکە "

دەگێڕنەوە: سەخییەک و ڕەزیلێک پێکەوە دەبنە هاوڕێ لە گەشتێکدا، پێکەوە ماوەیەکی باش ڕێگایان بڕی، پاشان بۆ پشودان لە بن سێبەری دارێکدا لایاندا، کابرای سەخی توێشووەکەی خۆی دەرهێناو وتی: ئێستا ئەمەی من دەخۆین و ئەوەی تۆش هەڵدەگرین بۆ ژەمی ئێوارە، هەر کە خۆر ئاوا بوو کەناری ئاسمان سورایی تێکەوت کابرای ڕەزیل بڕیاریدا بەتەنها توێشووەکەی خۆی بخوات و هاوڕێکەی لێ بێ بەش بکات، بەبیانوی ئەوەی گەشتەکەیان دوورەو برسێتیش زاڵمەو ڕەحم بەکەس ناکات، کابرای سەخی کە ئەمەی لە هاوڕێکەی بینی زۆر توڕەو نیگەران بوو؛ بۆیە بڕیاریدا لێی جیاببێتەوەو بەتەنها درێژە بە گەشتەکەی بدات، بەو تاریکی شەوە ملی ڕێگای گرتەبەر و ڕۆیشت ڕۆیشت هەتا گەیشتە کۆنە ئاشێک کە دەمێک بوو لەکارکەوتبوو، لەدڵی خۆیدا وتی ئەمشەو لەم کەلاوەیەدا دەمێنمەوەو بۆ سبەینێش خوا کەریمە، چاوێکی خێرای بەناو کەلاوەکەدا گێڕا بینی ژورێک لەسەرەوە هەیە، چووە ئەو ژورەی سەرەوە بۆ ئەوەی لەوێدا لێی بخەوێت، بەڵام پێش ئەوەی ڕابکشێت بینی کۆمەڵێک گیانلەبەری دڕندە بەشوێن یەکدا خۆیان کرد بە ناو کەلاوەکەدا، شێر، پڵنگ، کەمتیار، ڕێوی، چەقەڵ، بانبانک ــ جانەوەرێکە لە تیرەی سمۆرە دەست کورت و قاچ درێژە ـ.....

دوای ئەوەی هەمویان هاتنە ژورەوەو هەریەکەیان شوێنێکیان بۆ خۆیان گرت، شێرەکە بەپێوە ڕاوەستاو وتی: هاودارستانیانی خۆشەویشت سڵاوتان لێ بێ، خۆشحاڵم وا بۆ جارێکی ترو لە کۆبونەوەیەکی تری مانگانەدا بەدیدارتان شاد بوومەوە، پاشان وتی: ئەو ڕاپۆرتانەی کە بۆتان بەرز کردبوومەوە تەماشای هەمویانم کرد، دڵخۆش بووم بەوەی ئەرکەکانی سەرشانتان بەڕێک و پێکی

جێبەجێ کردووەو مامەڵەیەکی باشیشتان لەگەڵ گەل و هۆزی خۆتانـدا کـردووە، هەوڵ و کۆششەکانتان بەرز دەنرخێنم، دەستی مانـدوو بوونتـان دەگوشـم، هانتـان ئەدەم بۆ ئەوەی هەردەم وەرەتان بەرز بێت و هەرگیز بەچۆکـدا نەیەن، ئێستاش دەرگای گفتوگۆتان بۆ دەکەمەوەو ئەگەر یەکێکتان زانیارییەکی نوێی لایە با هەر ئێستا پێشکەشمان بکات.

کەمتیار وتی: ئەی پاشای دارستان ئەو نـاوچەی کە جەنابتـان بە گەورەیـی خۆتان سەرۆکاریتان بە بەندەی بچوکتان سپاردووە مشکێکی لێیە خـاوەنی سـەر لیرەی ئاڵتونە، هەموو رۆژێـک لەگەڵ هەڵهـاتنی خـۆردا دەریـان دەهێنێـت و بـۆ ماوەیەک ئەیانداتە بەر تیشکی خۆرو پاشان بۆ شوێنی خۆیانی دەگەڕێنێتەوە.

پڵنگ وتی: ئەی پاشای زرنگ و دانا ئەو ناوچەیەی کە فەخامەتتـان ئەرکـی بەڕێوەبردنیتان بەم بچوکەی خۆتان سپاردووە پاشایەکی لێیە دوور بێت لە ڕوی جەنابتان هەتا بڵێی ستەمکارە لە هەمـان کاتـدا زۆریـش ترسنۆکە، دارودەسـتەو پێوەنـدێکی زۆری هەیە کە هەرگیـز لە قسـەو فەرمانەکـانی دەرنـاچن، کچێکـی نەخۆشـی هەیە هەرچـی پزیشـکی شـارەزا هەیە هێنـاویێتیە سـەری نەیـانتوانیوە چارەسەری بکەن، بەڵێنیداوە هەر کەسێک چاکی بکاتەوە لێی مارە بکات، خاوەن شکۆ: چارەسەری نەخۆشـی ئەو کـچەی پاشـا دەمـاخی سـەگێکی دووسـەرە کە تەنها یەک شوان لە فلان ناوچە هەیەتی.

بانبانک ڕوی کردە شێرەکەو وتـی: ئەی ئەو کەسـەی کە بە دادگەریـیەکەت دڵی ژێردەستەکانی خۆتت بـردووە، بەیەکسانییەکەشـت کەفوکـوڵی دڵـی هەمـوو لایەکت دامرکاندووەتەوە، لە هەرێـمەکەی منیشـدا درەختێکـی بـێ بەر هەیە کە ڕەگەکانی ڕۆچووە بە ناخی زەویداو پەل و پۆکانیشی هەڵچووە بە ئاسمانا، بنـی ئەم درەختە گەنجینەیەکی سیخناخ لە ئاڵتون و زیوی تیایە.

ڕێوی وتی: سڵاو لە پاشای مەزنمان کە بە دادپەروەرییەکەی هەموانی گوێ لە مستی خۆی کردووەو سەدای نەڕەکەیشی یاخیبوان دێنێتە لەرزە، قوربان: نێچیرەکان بەلەسە بوون و هەموو تەکنیک و تەکتیکێک بەکار دێنن بۆ خۆدەرباز کردن لە دەستمان، بەزەحمەت و ماندوبونێکی زۆر نەبێت ڕاو ناکرێن.

چەقەڵ وتی: خاوەن شکۆ مرۆڤەکان تەیمان و پەرژینیان دروست کردووەو ڕێگای گەیشتن بە مریشکەکانیان لێ گرتوین، هەمومان برسێتی بەچۆکیدا هێناوین، ناچارکەوتوین لە جیاتی گوشتی مریشک سەوزەو بەروبومی درەختەکان بخۆین.

گورگ وتی: درود بۆ فەرمانڕەوای مەزن و لێوەشاوە کە لە پێناو دابین کردنی دادگەری لەم دارستانەدا هەردەم لە هەوڵی بێوچاندایە، قوربان: گورگگەلی ئەم دارستانە هەمویان سکاڵایان لە دژی مرۆڤەکان هەیە؛ چونکە نیشانەمان لێ دەگرن و تا ئێستا چەندانیان لێ لەناو بردوین، ئێمەش تۆ بەپارێزەری خۆمان دەزانین و چاوەڕوانین بەزوترین کات بێیت بەهانامانەوە.

کابرای سەخی لەسەرەوە گوێی لە هەموو ئەم قسەو باسانە بوو، هەناسەی لە خۆی بڕی بوو نەوەک ئەم دڕندانە پێی بزانن و نینۆکی تیژیان لە جەستەیدا نقوم بکەن و بیکەن بە خۆراکی ژەمێکیان.

دوای ئەوەی شەو تێپەڕی و دنیا کەمێک ڕۆشن بوویەوە هەمویان بڵاوەیان لێ کردوو هەریەکەیان چوون بەلایەکدا، کابرای سەخی خۆی گەیاندە شوێنی مشکەکە، تەماشا ئەکات ڕێک وەک ئەوەی کەمتیارەکە باسی کرد خەریکە لیرە لیرە دەیانهێنێتە دەرەوە، لێی گەڕا هەتا هەر سەدیانی هێنایە دەرەوە، بەردێکی پیاکێشاو کوشتی و سەد لیرەکەی هەڵگرت، ئەمجا ملی ڕێگای گرت بەرەو لای شوانەکە، دۆزییەوەو پێی وت : ئەم سەگەم پێ بفرۆشە بە دە لیرەی ئاڵتون.

شوانەکەش وەک ئەوەی دوو هەنگی لە دارێکدا دۆزیبێتەوە یەکسەر بە مامەڵەکە ڕازی بوو، کابراش سەگەکەی دوورخستەوەو لە ژێر سێبەری دارێکدا کوشتی و دەماخی دەرهێناو خستیە ناو شوشەیەکی خاڵییەوە کە پێشتر بۆ ئەم کارەی ئامادە کردبوو، پاشان بەرەو لای پاشا ملی نا، پێی وت: جەنابی پاشا بیستومە کچەکەت نەخۆشەو پزیشکانیش لە ئاستی نەخۆشییەکەیدا هەموویان دەستەوسانن، چی ئەکەیت بۆ ئەم بچوکەی خۆت ئەگەر چارەسەری نەخۆشییەکەی بکەم؟

پاشا وتی: ئەگەر چارەسەرت کرد ئەوا لێتی مارە دەکەم، خۆ ئەگەر نەیشت کرد ئەوا ملت لە لاشەت جیادەکەمەوە!

باشە چاکی دەکەمەوە بەڵام بەو مەرجەی لە ژورێکدا بێت کەسی لێ نەبێت تەنها من و نەخۆشەکە نەبێت.

کابرا چووە ناو ژورەکەو بە دەماخی سەگەکە جەستەی ئافرەتەکەی چەور کرد، ئەوەندەی پێنەچوو کچەکە دەستی کرد بە جموجوڵ، تۆزێک وەستاو جارێکی تر بە دەماخی سەگەکە جەستەی ئافرەتەکەی چەوری کردەوە، ئەمجارە چاویشی کردەوە، تۆزێکی تر لێی وەستاو جارێکی تر چەوری کردەوە، ئیتر کەوتە قسەکردن، تۆزێکی تر وەستاو جارێکی تر چەوری کردەوە، ئەمجارەیان هەستایەوە سەرپێ وەک ئەوەی هەرگیز نەخۆش نەبووبێ.

بۆ ڕۆژی دواتر پاشا بەڵێنەکەی خۆی بەجێگەیاندو بانگی قازی کردو لێی مارە کرد.

کابرا بە پاشای وت مامە گیان لە فلان شوێن درەختێکی ئاواو ئاوا هەیە، لەژێرید گەنجینەیەکی گەورە هەیە، پاشاش فەرماندەی سوپاو کۆمەڵێکی زۆر لە سەربازو کرێکاری لەگەڵدا نارد، بنی دارەکەیان هەڵدایەوەو گەنجینەکەیان

دەرکرد، بەشێک لە گەنجینەکەیان دابەش کرد بەسەر ئەو کرێکارانەی کە بنی دارەکەیان هەڵدایەوە، یەکێک لە کرێکارەکان کابرا ڕەزیلەکەی هاوڕێی بوو، لە کرێکارەکانی تر زیاتری پێدا، بەڵام وتی هەتا چیرۆکی خۆتم بۆ نەگێڕیتەوەو پێم نەڵێی بەم ماوە کەمە چۆن بەم پلەو پایە بەرزە گەیشتیت هیچت لێوەرناگرم، ئەوەی لە ناو کەلاوەی ئاشە کۆنەکەدا ڕویدا وردو درشتی بۆ گێڕایەوە، کابرای ڕەزیلیش بەپەلە خۆی گەیاندە لای ئاشە کۆنەکە، کات کاتی کۆبونەوەی مانگانە بوو، کابرای ڕەزیل چووە ژورەکەی سەرەوە، زۆری نەبرد مام شێر بەخۆی و هەموو ئەندامانی کابینەکەیەوە خۆیان کرد بەکەلاوەکەدا، پاشای دارستان داوای کرد کێ قسەیەکی هەیە بۆ وتن با بیکات، لەولاوە گورگ ڕاست بویەوەو وتی: خاوەن شکۆ چۆن قسە بکەین! لە کۆبونەوەی مانگی پێشودا هەندێک زانیاریمان درکاند مشکەکەو سەگەکە کوژران و گەنجینەکەش دەرهێنرا، گومان دەکەم کەسێک هەبێت گوێمان لێ بگرێت و کەڵکی خراپ لە زانیارییەکانمان وەربگرێت، ناو کەلاوەکەیان پشکنی کابرای ڕەزیلیان لە ژورەکەی سەرەوەدا دۆزییەوەو دەستبەجێ پارچەپارچەیان کرد.

## " فێڵی ژنان زاڵ بوو بەسەر فێڵی پیاواندا "

دەگێڕنەوە: بازرگانێکی کوتاڵ فرۆشی خەڵکی شاری عەککا لە دوکانەکەیدا پۆستەرێکی هەڵواسیبو لێ نوسرابوو: فێڵی پیاوان زاڵ بوو بەسەر فێڵی ژناندا، ڕۆژێک ئافرەتێک بە مەبەستی کوتاڵ کڕین دێتە ناو دوکانەکەیەوە،کە نوسینی سەر پۆستەرەکەی بینی زۆر توڕەو نیگەران بوو، بەخاوە دوکانەکەی وت: ئەوەی لەسەر ئەم پۆستەرە نوسراوە پێچەوانەکەی ڕاستە، پیاوان لە فرت و فێڵدا هەرگیز لە ژنانی نابەنەوە، ماوەیەکی باش مشتومڕیان کرد بەڵام هیچ لایەکیان نەیانتوانی قەناعەت بەلاکەی تر بکات، ئافرەتەکە چوو بەڕێی خۆیەوەو دوکاندارەکەش خۆی سەرقاڵ کردەوە بەکاروباری دوکانەکەیەوە...

بەدرێژایی ڕێگەی گەڕانەوەی بۆماڵەوە ئافرەتەکە هەر بیری لەوە دەکردەوە چۆن بتوانێت سەری ئەم دوکاندارە ناحاڵییە نەوی بکات.

بۆ سبەینێ خۆی گۆڕی و جلوبەرگێکی پیرەژنانەی لەبەر کرد، گۆچانێکی گرت بەدەستەوە، چاویلکەیەکی لەچاو کرد کە گەردبینەکەی یەکجار ئەستور بوو، هەر ئەتوت پیرە ژنی سەد ساڵەیە.

هاتەوە بۆ لای دوکاندارەکە بەڵام بەبێ ئەوەی بیناسێتەوە، بەدەنگێکی کزو لەرزۆکەوە وتی: کاکی دوکاندار کوڕێکم هەیە لە خوام دەوێ لێمی بسێنێتەوە، بەخوا گیرم خواردووە بەدەستیەوەو ژیانی لێ تاڵ کردوم، نە ئامۆژگاری کەس وەردەگرێت نە گوێ بە قسەی کەس دەدات، عاشقی ئافرەتێک بووە هاوکات ئافرەتەکە مێردی هەیە، هەرچەند هەوڵی لەگەڵدا ئەدەم دەستبەرداری ئەو ژنە مێردداره ببێت بەڵام بێ سودە، بەڵێنی بە ژنەکە داوە کە کوتاڵێکی بۆ بکڕێت لەم شارەدا وێنەی نەبێت، دوکاندارەکەش وتی: دوو ڕۆژە لە ئەستەمبوڵەوە کوتاڵێکی نوێمان بۆ هاتووە نەک تەنها لەم شارە بەڵکو لە هەموو وڵاتی شامدا

وێنەی دەست ناکەوێت، پیرەژنەکە وتـی: ئەکرێـت پـارچەیەکم لەو قوماشە بۆ ببڕێت بۆ ئەوەی پیشانی کـوڕەکەمی بـدەم و ئەویـش پیشـانی خۆشەویستەکەی بدات بزانێت بەدڵیەتی. کوتاڵ فرۆشەکەش بە ئەندازەی لەپەدەستێکی بۆ بڕی و دایە دەستی.

ئافرەتەکە هەر لە دوکانەکە هاتە دەرەوە پرسیاری ماڵی دووکاندارەکەی کردو ناونیشانی ماڵیانی وەرگرت، چوو ماڵیانی دۆزییەوەو لە دەرگای داو ژنی قوماش فرۆشەکە کە دەرگای لێ کـردەوە، وتـی: کچـم لە شـارێکی تـرەوە هـاتوم نـوێژم نەکـردووە، ڕێـگەم پـێ ئەدەیـت بـێمە ژوورەوە دەسـتنوێژێک بگـرم و نـوێژەکەم بکەم،ئەویش فەرمووی بۆ ژورەوە لێ کردو بەگەرمی بەخێری هێنا، ئاوی بۆ هێنا دەستنوێژی گرت و شوێنی نوێژ کردنی بۆ ئامادە کرد، ئافرەتەکەدەستی کـرد بە نوێژ کردن و خاوەن ماڵەکەش چوو بەدەم ئیشوکاری ناو ماڵەوە، ئافرەتەکە هات پارچە پەڕۆکەی دەرهێناو لەسەر جێگـای نوسـتنەکەیان دایـناو لە مـاڵەکە هـاتە دەرەوە، کابرای دوکاندار بۆ پشوی نیوەڕۆ هاتەوە بۆ ماڵەوە، تەماشا ئەکات پارچە پەڕۆکە لەسەر جێگای نوستنەکەیان کەوتووە، کە ئەم دیمەنەی بینـی دڵنیـا بـوو لەوەی خۆشەویسـتی کـوڕی پیـرەژنەکە هـاوژینەکەی خـۆیەتی. بـۆیە بەخێرایـی بانگی ژنەکەی کردو پێی وت: هەر ئێستا کەلوپەلەکانت دەپێچیتەوەو هەتا ماڵی باوکت ناوەستیت، ژنەکەیشی وتی: تخوا چی بووە بـۆ پـێم ناڵێیـت، وتـی: پـێم وتیت هەتا زووە لەبەرچاوم ونبە، بێیتەوە بەلای ئەم ماڵەدا ملت لە لاشەت جیا دەکەمەوە.

کوتـاڵ فرۆشـەکە بەم حـاڵەوە بـۆ مـاوەیەکی زۆر بەو خەفەت و ئـازارەوە دەتلایەوە، ڕۆژێک ئافرەتەکە دای بەلای دوکانەکەیدا بینـی زۆر مـات و مەلولە:

بۆیە بەزەیی پیایدا هاتەوەو وتی: ئێستا کاتی ئەوەیەئەوەی تێکمداوە چاکی بکەمەوە، بۆیە بەپەلە خۆی گەیاندەماڵەوەو جلە پیرەژنانەکەی لەبەر کردەوەو چاویلکە ئەستورەکەی لەچاو کردەوەو هاتەوە بۆ دوکانی کابرای کوتاڵ فرۆش، هەر کە لە دوورەوە ئەمی بینی وەک شێت لەسەر کورسیەکەی هەستایەوەو پەلاماریدا، بەڵام کڕیارێک لە ناو دوکانەکەیدا بوو نەیهێشت دەستی پێ بگەیەنێت.

_ ئەوە بۆ پەلامارم ئەدەیت، چ خراپەیەکم بۆت بووە؟!

+ کورە بڕۆ نەفرینی خوا لە خۆت و کوڕەکەیشت بێت

_ ئەم هەمووە هاتوو هاوارەت تەنها بۆ ئەو پارچە قوماشە بوو کە لێم وەرگرتیت

+ پێم ناڵێی ئێستا تۆ بۆچی هاتویتەوە بۆ دوکانەکەم؟!

_ هاتوم بۆ ئەوەی پارچەیەکی ترم لەو قوماشە پێ بدەیتەوە؛ چونکە ئەو ڕۆژەی پارچە قوماشەکەت پێدام بەمەبەستی نوێژ کردن لە دەرگای ماڵێکمدا، ژنێکی بەحەیاو حورمەت دەرگای لێ کردمەوەو ئاوی دەست نوێژی بۆ هێنام، شوێنی نوێژ کردنی بۆ ئامادە کردم، ئا لەو ماڵەدا پارچە قوماشەکەم بیرچوو، ئێستاش ماڵەکەم لێ ون بووەو هەرچیش ئەکەم ناچمەوە سەری، هاتوم هەر لەو قوماشە پارچەیەکی ترم پێ بدەیت.

کوتاڵ فرۆشەکە بە بیستنی ئەم قسانە ڕۆشنایی کەوتە نێوچاوانیەوە، وتی: تخوا بەڕاستە؟!

_ تخوا بەم سەری پیرییەوە من هی ئەوەم درۆ بکەم،

+ کورە بەقوربانت بم، ئەوا ئەو تۆپە قوماشە هەر هەموی بۆ تۆو پارەشم ناوێت.

بەپەلە دوکانەکەی بەجێهێشت بۆ ئەوەی بچێت ژنەکەی بهێنێتەوە. بۆسبەینێ منداڵێک نامەیەکی هێناو دایە دەستی کوتاڵ فرۆشەکەو بەخێرایی ڕۆیشت، کە نامەکەی کردەوە تەماشا ئەکات لێی نوسراوە من کوڕم نیەو خۆشەویستیش لەئارادا نیە، بەڵام فێڵی ژنان زاڵ بوو بەسەر فێڵی پیاواندا.

کوتاڵ فرۆشەکەش دەستبەجێ پۆستەرەکەی لێ کردەوەو پۆستەرێکی تری لە شوێنیداهەڵواسی و لێی نوسی:"بەڵێ فێڵی ژنان زاڵ بوو بەسەر فێڵی پیاواندا"

## " كەس برینی خۆی بیر ناچێتەوە "

ڕەگێڕنەوە: شوانێک کردبوی بەنەریت هەموو جارێک مەڕوماڵاتەکەی لە لەوەڕگایەکی نزیک لە گوندەکەی خۆیان دەلەوەڕاند، نەریتیشی وابوو هەر کە مەڕوماڵاتەکەی دەستیان بە لەوەڕ دەکرد ئەمیش بە شمشاڵەکەی ئاوازی خۆشی بۆ دەچڕین، جارێک ئاوازەکەی هێندە خۆش و چێژ بەخش بوو مارێکی لە کونەکەی هێنایە دەرەوەو لەبەردەمیدا دەستی کرد بە سەما کردن، پاشان مارەکە خۆی کردەوە بە ناو کونەکەیداو لیرەیەکی ئاڵتونی دەرهێناو فڕێیدا بۆ شوانەکەو ئیتر خۆی بزر کرد.

شوانەکەش لیرە ئاڵتونەکەی هەڵگرت و بەدڵخۆشیەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، بۆ سبەینێش مەڕوماڵاتەکەی بۆ لەوەڕ هێنایەوە بۆ هەمان شوێن، هەر ئەوەندەی شمشاڵەکەی دەرهێناو دەستی کرد بە شمشاڵ ژەندن مارەکە هاتەوە دەردوەو وەک دوێنێ دەستی کردەوە بە سەما کردن، پاشان گەڕایەوە بۆ ناو کونەکەی و لیرەیەکی ئاڵتونی دەرهێناو فڕێیدا بۆ شوانەکە، ئەویش هەڵیگرتەوەو مارەکەش خۆی بزر کردەوە!

ڕۆژانە ئەمە دوبارە دەبویەوە، تا وای لێهات بارودۆخی دارایی شوانەکە هەڵکشانێکی باشی بەخۆیەوە بینی، بۆیە بڕیاریدا بچێت بۆ حەج، مەڕوماڵاتەکەی ڕادەستی کوڕەکەی کردو ئامۆژگارییەکی زۆری کرد کە زۆر ئاگاداری مەڕوماڵاتەکە بێت و لە هەر کوێیەک ئەیانلەوەڕێنێت بیانلەوەڕێنێت بەڵام نزیکی فلان شوێن نەبێتەوە، بەبێ ئەوەی هۆکارەکەی بۆ ڕون بکاتەوە، باوکەکە بەرەو شاری مەککە بەڕێکەوت و کوڕەکەیشی ڕۆژانە مەڕوماڵاتەکەی دەلەوەڕاند، تا ڕۆژێک بیری لەوە کردەوە ئەرێ باوکم بۆچی ئەو شوێنەی لێ قەدەغە کردم؟!بەخوا دیارە ئەم ماستە بێ مو نیە!

ئەمە بوو بە ماخۆلانی سەری؛ تا ڕۆژێک بڕیاریدا مەڕومالاتەکە ببات بۆ ئەو شوێنە بزانێت لەوێ چ باسە، هەرکە فوی بە شمشاڵەکەیدا کرد مارەکە لە کونەکەیەوە هاتە دەرەوەو وەک نەریتی جارانی دەستی کردەوە بە ڕەقس و سەما کردن، پاشان خۆی کردەوە بەناو کونەکەیداو لیرەیەکی دەرهێناو فڕێیدا بۆ گەنجەکەو ئیتر خۆی ون کرد.

ئەویش لیرەکەی هەڵگرتەوەو بەدەم گۆرانی وتنەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، لەدڵی خۆیدا وتی: ببێ و نەبێ ئەم مارە گەنجینەیەکی گەورەی شاردووەتەوە، ئەگەر بتوانم بیکوژم ئەوا ئەو گەنجینە بە تەنها بۆ خۆم دەبێت و ژیانم بە یەکجاری دەگۆڕێت!

بۆ سبەینێ لەگەڵ شمشاڵەکەیدا شمشێرەکەیشی هەڵگرت و بڕیاریدا مارەکە بکوژێت و گەنجینەکە بهێنێتەوە، مەڕومالاتەکەی لە شوێنەکە نزیک کردەوەو دەستی کرد بە شمشاڵ ژەندن، مارەکەش وەک نەریتی هەموو جارێکی لە کونەکەیەوە هاتە دەرەوەو دەستی کردەوە بە خۆبادان و سەما کردن. گەنجەکە شمشێرەکەی هەڵکێشاو هێنایەوە بۆ مارەکە، لە کلکیداو پەڕاندی، مارەکەش پڕی دایە گەنجەکەو پێوەی داو هەر لەوێدا جوڵەی لێ بڕی!

باوکەکە لە حەج گەڕایەوە، پێیان وت کوڕەکەت لە فلان شوێندا مار پێوەی داوەو کوشتویەتی، لە دڵی خۆیدا وتی بەخوا ببێ و نەبێ ئەمە کاری مارە خاوەن لیرەکەیە، بڕیار بێت تۆڵەی کوڕەکەمی لێ بکەمەوە!

دوای چەند ڕۆژێک مەڕومالاتەکەی بردەوە بۆ هەمان شوێن، دەستی کرد بە شمشاڵ ژەندن و چرپینەوەی ئاوازە کۆنەکان، مارەکە وەک جاری جاران لە کونەکەیەوە هاتە دەرەو پاش ماوەیەک سەما کردن خۆی کردەوە بە کونەکەیداو

لیرەیەکی ئاڵتونی دەرهێناو فڕێیدا بۆ شوانەکەو وتی: ها ئەم لیرەیەش بگرە، بەڵام ئیتر نەیەیتەوە بەم گوزەرەدا؛ چونکە نە تۆ کوڕەکەت بیـر دەچێـتەوەو نە منـیش کلکم بیردەچێتەوە.

Scanned with CamScanner

## " ئەو ژنەی داوای جیابونەوەی دەکرد "

دەگێڕنەوە: ئافرەتێک هەبوو هەردەم لەگەڵ هاوسەرەکەیدا لە گێرەو کێشەدا بوون، بۆیە بڕیاریدا لێی جیاببێتەوە، بۆ ئەو مەبەستە چوو بۆ لای مەلای گوندەکەیان، کە زۆر جار خەڵک بۆ چارەسەر کردنی کێشەکانیان پەنایان بۆ مەلای گوند دەبرد، چیرۆکی خۆی بۆ گێڕایەوە، مامۆستاش وتی: باشە لە مێردەکەتت جیادەکەمەوە بەڵام بە مەرجێک

_ مەرجەکەت چیە جەنابی مامۆستا؟

+ مەرجەکەم ئەوەیە تاڵە مویەکم لە سمێڵی شێر بۆ پەیدا بکەیت

_ سمێڵی شێر...... باشە قوربان تۆ ئەتەوێت بە کوشتم بدەیت یان لە مێردەکەمم جیا بکەیتەوە؟!

+ئەوە تاکە مەرجی منەو ئیتر تۆش کەیفی خۆتە

ژنەکە بیری کردەوە مامۆستا دوو بژاردەی پێداوە یەک لە یەک تاڵترن، یان ئەوەیە لەگەڵ مێردەکەیدا درێژە بەژیان بدات و گیروگرفتەکانیان هەر بەردەوام بێت و ڕۆژانە دەرودراوسێ گوێبیستی شەڕو هاتوهاواریان بن، یان ئەوەیە بچێت بۆ دارستان و ژیانی خۆی بخاتە مەترسیەوە لە پێناو بەدەستهێنانی ئەو تاڵە مووە؛ چونکە ئەوە تاکە ڕێگەی ڕزگار بونیەتی لەدەستی مێردە لاسارەکەی.

ژنەکە بژاردەی دووەمی لەلا دڵگیرتر بوو، بۆیە چوو بۆ بازاڕ بەرخێکی قەڵەوی کڕی و بردی بۆ دارستان لە نزیک لانەی شێرێکدا بەستیەوە، خۆیشی لە دوورەوە چاودێری دەکرد تا شێرەکە هات و خواردی.

بۆ ڕۆژی دووەمیش دووبارە چویەوە بۆ بازاڕو بەرخێکی تری کڕی، بەڵام ئەمجارە نزیکتر لە لانەی شێرەکە بەستییەوە، دوبارە شێرەکە هات و ئەمیشی خوارد.

ڕۆژی سێیەمیش چویەوە بۆ بازاڕو بەرخێکی تری کڕی، بەڵام بڕیاریدا ئەمجارە بەهەر نرخێک بووە زیاتر لە شێرەکە نزیک ببێتەوەو تاڵێک لە سمێڵی لێ بکاتەوە، بەرەو لای بێشەی شێرەکە ملی ڕێگای گرت و ڕەشۆی ملی بەرخەکەیشی بەدوای خۆیدا ڕاکێشا تا تەواو لە شێرەکە نزیک بوویەوە، بەرخەکەی لەبەردەمیدا بەرەڵا کرد، شێرەکەش پڕی دایەو کەڵبەکانی لەقوڕگی توند کرد هەتا لەپەلوپۆی خست، ئەوجا دەستی کرد بەخواردنی، ئەمیش لەسەری ڕاوەستابوو تەماشای دەکرد، دوای ئەوەی شێرەکە تێری خواردو چوارپەلی ڕاخست بۆ ئەوەی بخەوێت ئەمیش چووە پەنایەوەو بە شێنەیی دەستی هێنا بەسەریدا تا خەوی لێ کەوت، دەستی بردو زۆر بەنەرمی تاڵێک لە سمێڵی لێ کردەوە، بەخێرای گەڕایەوەو خۆی گەیاندە لای مامۆستاو تاڵە سمێڵەکەی دایە دەستی.

مامۆستا تاڵە سمێڵەکەی گرت بەدەستەوەو وتی: تخوا شەرم و شورەیی نیە بۆ تۆ بتوانیت شێرێک بەو دڕندەییەی خۆیەوە ڕام بکەیت و تاڵێک لە سمێڵی لێ بکەیتەوە بەڵام نەتوانیت لەگەڵ مێردەکەتدا خۆت بگونجێنیت؟!

ژنەکە لەشەرمدا سور هەڵگەڕاو بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی و هەموو هەوڵێک بەخەرج بدات بۆ خۆشکردنی نێوان خۆی و مێردەکەی.

## " دابەشکردنی ڕێوی "

دەگێڕنەوە: شێرێک و ڕێوییەک و گورگێک لەگەشتێکی ڕاوکردندا پێکەوە بوون بە هاوڕێ ، ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی هەرچیان ڕاو کرد هیچی لێ نەخۆن هەتا دانی ئێواێ.

سەرەتا ئاسکێکیان ڕاو کرد لە شوێنێکی بێترسدا شاردیانەوە، پاشان گوێدرێژێکیشیان ڕاوکردو لەو شوێنەی ئاسکەکەیان تێدا شاردبوویەوە گوێدرێژەکەشیان شاردەوە، هێشتا خۆر هەر بەئاسمانەوە بوو کەروێشکێکیشیان ڕاو کرد، لەگەڵ خۆرئاوا بووندا هەرسێکیان پێکەوە گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنەی نێچیرەکانیان تێدا حەشاردا بوو.

شێرەکە بە گورگەکەی وت: ئادەی ئەم نێچیرانە دابەش بکە لە نێوانماندا

گورگەکە وتی: ئاسکەکە بۆ تۆ، گوێدرێژەکەش بۆ من، کەروێشکەکەش بۆ ڕێوی

شێرەکە زۆر بە توندی نەڕاندی بەسەریداو یەک چەپۆکی پێدا کێشا لە خوێنی خۆیدا گەوزاندی.

پاشان تەماشایەکی ڕێویەکەی کردو وتی: ئادەی تۆ دابەشیان بکە، وتی قوربان دابەشکردنی بۆ چیە؟ جگە لە جەنابتان کێ حەدی هەیە پشکی هەبێت؟ "کەروێشک جیاتی پەنیرونان، ئاسکیش بۆ ژەمی نیوەڕوان، گوێدرێژ بۆ ژەمی شێوان، نۆشی گیانت بێ قوربان"

شێرەکە وتی: ئەی ڕێوی کێ فێری ئەم دابەشکردنە دادپەروەرانەی کردی؟

وتی قوربان خوێنی گورگەکە فێری کردم.

شێرەکە دای لە قاقای پێکەنین و بەپشتدا کەوت.

## " لە سکی دایکییەوە بۆ ناو گۆڕ "

دەگێڕنەوە: کابرایەکی عەرەب هەبوو بەناوی جەبر، ئەم کابرا کەسێکی گەڕیدە بوو، هەردەم لەگەشت و گەڕاندا بوو، لەم شار بۆ ئەو شارو لەم گوند بۆ ئەو گوند، لە یەکێک لە گەشتەکانیدا ڕێی لە گوندێک دەکەوێت و بەلای گۆڕستانەکەیدا تێدەپەڕێت، لە ناو گۆڕستانەکەدا شتێکی سەیرو سەرنج ڕاکێشی بینی!

لەسەر کێلی هەموو گۆڕێک ناوو تەمەنی مردووەکە نوسرابوو، لە هەمووی سەیرتر ئەوە بوو قەبارەی گۆڕەکان زۆر گەورەتر بوون بەبەراورد بەتەمەنی مردووەکانی ناوی، تەمەنەکان تەمەنی منداڵ بوون بەڵام گۆڕەکان گۆڕی زەلام بوون،

گۆڕێکی بینی لەسەری نوسرابوو خاوەنی ئەم گۆڕە ناوی سەعدە، تەنها ساڵێک و سێ مانگ ژیاوە!

گۆڕێکی تری بینی لێ نوسرابوو خاوەنی ئەم گۆڕە ناوی سوعادە، دوو ساڵ و یەک هەفتە ژیاوە!

لە هەر گۆڕێکەوە دەچوو بۆ گۆڕێکی تر زیاتر سەرسام دەبوو، تا گەیشت بە پاسەوانی گۆڕستانەکەو پێی وت: ئەرێ براله من زۆر شاران گەڕاوم و شتی سەیرو سەمەرەی زۆرم دیوە، بەڵام ئەوەی لەم گوندەدا دیومە لە هیچ شوێنێکی تردا نەمدیوە، پاسەوانەکە زەردەخەنەیەکی کردو وتی: ڕەنگە گۆڕی درێژو تەمەنی کورتی مردوی ناو ئەم گورستانە توشی شۆکی کردبێت!

وتی: بەڵێ، ئەی چۆن قوشقی نەبم گۆڕ گۆڕی زەلامەو تەمەن تەمەنی منداڵ.

پاسەوانەکە وتی: ئاخر ئێمە تەنها ئەو کاتانە بە تەمەن هەژمار دەکەین کە بە خۆشی تیایدا ژیابین، بۆ نمونە سەعد پەنجا ساڵ ژیاوە، لەو پەنجا ساڵە

تەنها یەک ساڵ و سێ مانگ خۆش ژیاوە، ئەوی تری هەموی لە بەدبەختی و کوێرەوەریدا بەسەر بردووە، ئێمە تەنها ئەو تەمەنەمان بۆ نوسیوە کە خۆشبەخت بووە تیایدا، ئەویتری کە لە نەگبەتی بەدبەختیدا گوزەراندویەتی لێمان فڕێداوە.

جەبریش وتی دەی مادام وایە ئەگەر مـن لەم گونـدەدا مـردم لە سـەر کێلـی گۆڕەکەم بنوسن "خاوەنی ئەم گۆڕە ناوی جەبرەو لە دنیادا هیچ نەژیاوە، لە سکی دایکیەوە بۆ ناو گۆڕ"!

❁ ❁ ❁

# " ژێری ژنێك "

دەگێڕنەوە: لە یەکێک لە گونـدە دوورە دەسـتەکاندا کە خەڵـکەکەی دوور لەو کیـنەو خۆپەرسـتییەی کە لە شـاردا بـوونی هەیە هەمـوان وەک بـرا دەژیـان، خۆشەویسـتی و تەبـایی بـاڵی کێشـابوو بەسـەریاندا، لە ئیشـوکارە سـەخت و دژوارەکانی وەک جوت، گێرە، دروێنە، قوڕەبان و هتـد.... هاوکـارو دەسـتباری یەکتری بوون.

لەم گوندەدا پیاوێکی دەوڵەمەند هەبوو، ڕووخۆش و خەندە لەسەر لەب، نەرم و نیان و بە ئەدەب، ڕەوشـت بەرزو خـۆش مەشـرەب، ئەوەی پێوسـتی بە پـارە هەبوایە قەرزی پێ ئەدا، ئەگەر هەژارو نەدار بـوایە لێـی وەرنەدەگـرتەوە، ئەگەر کەسـێک لێــی بقەومــایە لەلایەک بەوتەی شــیرین و لەلایەک بە ســامانەکەی دڵنەوایـی دەکـرد، ئەگەر مـاڵە هاوسـێیەکی میوانێکیـان بهاتـایە ئەم خـواردن و پێداویستی بۆ دەناردن بۆ ئەوەی بەڕوسوری میوانەکەی پێ بەڕێ بکەن!

ئەم پیاوە سێ کچی هەبوو گەورەکەیان خەریک بوو خۆی ئەدا لە سی ساڵ، تا ئەو کاتەش هیچ کام لە گەنجانی گوند نەهاتبونە خـوازبێنی، بە پـێچەوانەی کچانی تری هاوڕێ و هاوگونـدی کە هەر لە تەمەنێکـی منـداڵی و لە سـەرەتای پێگەیشتنیانەوە چوبونە ژیانی هاوسەرگیرییەوە.

لەشــەوێکی مــانگە شــەوی وەرزی هاوینــدا ئەم پیــاوە دەوڵەمەنــدە لە گەڵ ژنەکەیدا لە حەوش و حەساری ماڵەکەیاندا دانیشتبوون وپـێکەوە قسـەو باسـیان دەکـرد، ژنەکە بە پیــاوەکەی وت: ئەرێ بــۆ بیرێــک لە حــاڵی ئەم کچــانەت ناکەیتەوە؟!

_ بۆ؟! ئەم کچانە لە چ شتێکیان کەمە؟!

+ ئەی نابینیت کچانی گوند هەموویان مێردیان کردووەو منداڵیشیان بووە، ئەوەتا کچە گەورەکەی خۆشمان وا خەریکە تەمەنی ئەبێت بە سی ساڵ و هێشتا خوازبێنیکەری نەهاتووە!

_ ڕاست دەکەیت، بەڵام بەڕای تۆ هۆکارەکەی بۆ چی دەگەڕێتەوە؟

+ وەڵا هۆکارەکەی تەنها سەروەت و سامانەکەی تۆیە!

_ سەروەت و سامانی من بۆ؟!!!

+ئەی ئەگەر گەنجێک نیاز بکات لە دەرگا بدات و بێتە خوازبێنی یەکێک لە کچەکانت لە دڵی خۆیدا دەڵێت: کورە ئەوانە کچە دەوڵەمەندن چۆن لوت بە ئێمەیەکی هەژارو نەداردا ئەهێنن؟! یان ئەگەر بیشزانێ پێی ڕازی دەبێ دەڵێت: باشە گوناهی ئەم کچە چیە من بێم لەو ژیانە پڕ لە نازو نیعمەتەی ماڵی باوکییەوە دەری بکەم بۆ ناو ئەم ژیانە پڕ لە کەسەرو دەردی سەرییەی خۆم، لەو کۆشک و تەلارەی ماڵی باوکییەوە بیپێچمە ناو کۆڵیت و کوخێکەوە!

پاشان وتی: هەموی سوچی تۆیە، تۆ هۆکاریت... پێویستە کارێک بکەیت

پیاوەکە تۆزێک خۆی تورە کردو وتی: من چی بکەم؟ بچم مێردیان بۆ بکڕم؟!

ژنەکە زەردەخەنەیەکی کردو وتی: نا ، بەڵام ڕۆژی هەینی بچۆ بۆ لای مەلای گوندو پێی بڵێ: مامۆستا گیان وەک لای جەنابتان شاراوە نیە ئێستا بووە بە باو بۆ مارەیی ژن بڕێکی زۆر دیاری دەکرێت و گەنجانی ئەمڕۆش ئەو بڕە زۆرەیان پێهەڵناسوڕێت، ئەگەر بکرێت وتاری ئەم هەینیە تەرخان بکەیت بۆ باسی "کەمکردنەوەی بڕی مارەیی" ئەوا کارێکی زۆر باش دەکەیت، پاشان کە مامۆستا لە وتارەکەی بویەوە تۆش وەسف و سەنای وتارەکەی مامۆستا بکە، ئەو کات خەڵک دەزانن تۆ بۆ کچەکانت چاوت لە مێردی دەوڵەمەندت نیە!

کابرای دەوڵەمەند چو بۆ لای مەلای گوندو داوای لێ کرد ئەو باسە بوروژێنێت و مامۆستاش وای کرد!

کە مامۆستا لە وتارو نوێژی هەینی بویەوە کابرا لە ناو مزگەوتدا هەستایە سەر پێ و وتی "دەک یاخوا دەست و دەمت خۆش بێت مامۆستا بۆ خۆت و بۆ وتارت، خەڵکینە مامۆستا چی فەرموو با وا بکەین، ئێمە هەمومان برای یەکین، کەسمان لە ئەوی ترمان باڵاتر نین، هەمومان لە ئادەمین و ئادەمیش لە گڵە" پاشان لایەکی کردەوە بەلای یەکێک لە ئامادە بوانداو ئاماژەیەکی بۆ کردو وتی: کاکە ئەوە مام عبدالله بەخوا ئەو هەرگیز گەنجێکی دەرەوەی ئەم گوندەی لە گەنجێکی گوندەکەی خۆمان پێ باشتر نیە، ئەوە حاجی موحەمەد دەرگای کراوەیە، ئەوە من دەرگام کراوەیە، فەرمون با بەهەمووما‌نەوە کارئاسانی بۆ گەنجانی گوندەکەی خۆمان بکەین تا خواش کارئاسانی بۆ ماڵ و منالی ئێمە بکات، سەروەت و سامان گرنگ نیە، گرنگ ئەوەیە کوڕەکە دیندارو ڕەوشت بەرز بێت.

هەفتەیەک تێنەپەڕی هەر سێ کچەکەی بە شوێنی یەکدا خوازبێنیکەریان هاتن و بەمێردی دان.

# " دەرگای ئەم ماڵە دادەخرێت "

دەگێڕنەوە: یەکێک لە پیاوە ژیرو داناکانی عەرەب کە هەردەم جێی متمانەو ڕازونیازی خەڵک بوو، بۆ چارەسەرکردنی کێشمەکێشم و ناکۆکییەکان پەنایان بۆ دەهێناو بڕیارو ڕاسپاردەکانیشی بەبایەخەوە جێبەجێ دەکرا.

ئەم پیاوە لەگەڵ ئەوەی بە واتای وشە فەیلەسوف بوو کەسێکی دەوڵەمەندو خوا پێداویش بوو، بۆیە زۆر جار بە سامانەکەی لەمپەرەکانی بەردەم چارەسەرکردنی کێشەو ناکۆکییەکانی لادەبرد، بەڵام خودا تەنیا کوڕێکی پێدابوو، کە زۆر بەباشی پەروەردەی کردبوو، تا ئەو کاتەش بوو بە زەلام هەر چاوی لەسەری بوو!

هەموو ڕۆژێک ماڵیان جمەی دەهات لە خەڵک، ئەم دەستە دەڕۆیشت و دەستەیەکی تر دەهات، هەمووشیان پێش ئەوەی لە ماڵەکەی بچونایەتە دەرەوە کێشەو ناکۆکییەکانیان بۆ چارەسەر دەکرا.

ڕۆژێک ئەم پیاوە لە شوێنێکدا بەتەنیا دانیشتبوو، خەیاڵی ڕۆشتبوو، نیشانەی خەمێکی قوڵ لە ڕوخساریدا بەدی دەکرا، کوڕەکەی هات بۆ لای و وتی:

_ ئەوە چیە باوکە گیان خەم و پەژارەیەکی زۆر ڕوخساری داگرتوی، بیر لەچی ئەکەیتەوە؟!

+ کوڕم بیر لەوە دەکەمەوە کە من دەمرم و دەرگای ئەم ماڵە بەڕوی خەڵکانی کێشەداردا کڵۆم دەدرێت، لەبەر ئەوەی کەسێک نابێت داوەری بکات لە نێوانیاندا کێشەو ناکۆکییەکانیان هەر بە هەڵواسراوی دەمێننەوە، خەم و پەژارەی ئەوە دایگرتووم.

_ یاخواهەر تەمەن درێژ بیت و هەرگیز مەرگت نەبینم، خوا نەکردە ئەگەر ئەوەش ڕویدا ناهێڵم جێگاکەت بە چۆڵی بمێنێتەوە، خۆم داوەری لە نێوانیاندا دەکەم و دەرگای ئەم ماڵەش هەردەم کراوەو لەسەر پشت دەبێت.

+ کـوڕم ئەگەر ئەو ڕۆژە هـات و شـوێنی منـت گـرتەوە، سـەخییەک و ڕەزیلێـک نـاکۆکی و مشـتومڕ کەوتە نێوانیـانەوە چـۆن داوەری لە نێوانیانـدا دەکەیت؟

_ لە سەخییەکە دەپچڕم بۆ ڕەزیلەکە، سەخی بەبێ ئەوەی گەڕی تێبهاڵێنن ئەبەخشێت ئەی ئەگەر گەڕیان تێهاڵاند چۆن نابەخشێت!

باوکەکە زەردەخەنەیەکی کردو دیار بوو وەڵامی کوڕەکەی بەدڵدا چـوو بـوو، پاشان وتی کـوڕم ئەی ئەگەر دوو ڕەزیـل نـاکۆکی و مشـتومڕ کەوتە نێوانیـانەوە چۆن پێکیان دێنیتەوە؟

_ لە بەرکی خۆم دەردەکەم و پێکیان دێنمەوە

+ ئەی ئەگەر دووسەخی مشتومڕ کەوتە نێوانیانەوە؟

_ دوو سەخی هەرگیز مشتومڕیان لە نێوانیاندا ڕونادات، خۆ ئەگەر ڕویشیدا ئەوا هەر تاوێکەو دواتر دەگەڕێنەوە سەر ڕیشەی ڕەسەنی خۆیان، بۆیە پێویست بە داوەری ناکات لە نێوانیاندا

+ بەخوا ڕۆڵە کوڕی باوکی خۆتی، پیاو کـوڕی وەک تـۆی ببـێ ئەگەر هەر ئەو دەمەش بمرێ بۆشایی بەجێناهێڵێ.

# " وای زانی دەست قوچاوە "

دەگێڕنەوە: پیاوێکی هەژارو دەست کورت هەبوو، هاوکات خاووخێزانێکی زۆریشی بەسەردا کەوتبوو، هانای بۆ یەکێک لە هاوڕێکانی برد بۆ ئەوەی دەستگیرۆیی بکات و تۆزێک باری قورسی سەرشانی سوک بکات، بەڵام پۆزشی بۆ هێنایەوەو وتی: خۆت بارودۆخەکەت لەبەرچاوە، ساڵ ساڵی گرانی و قات و قڕییەو ئەوەی هەمە بەتەواوی بەشی خاووخێزانی خۆیشم ناکات، بەڵام دەتنێرم بۆ لای کەسێک بڕوا ناکەم دەست بنێت بەڕوتەوە.

چوو بۆ لای ماڵی کابرا تەماشا ئەکات خۆی سەرقاڵ کردووە بە چارەسەر کردنی بزنێکی نەخۆشەوە، لە دڵی خۆیدا وتی: ئەمە سەرەڕای ئەو هەمووە مەڕوماڵاتە چاو لە بزنە لاتێک نابوێرێ، جا چۆن هیچی بۆ من لەدەست دەبێتەوە ؟! بەبێ ئەوەی هیچی پێ بڵێ بەشوێنی خۆیدا گەڕایەوە بۆ لای هاوڕێکەی و چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوەو پێی وت:

_ بەخوا برا کابرای لای تۆ کەسێکی چروک و دەست قوچاو دەرچوو

+ هیچت پێ وت؟

_ کە ئەوەم لێ بینی هیچم پێنەوت

+ بچۆرەوە بۆ لای و داوای لێ بکە، بەدەستی خاڵی ناتگێڕێتەوە.

ئەمجارەش گەڕایەوە بۆ لای ماڵی کابرا تەماشا ئەکا ئامۆژگاری کوڕەکانی ئەکات: ڕۆڵە کە باراشەکەتان برد بۆ ئاش ئەگەر یەک دەنکە گەنمیشی لێرژا هەڵیگرنەوە، لە دڵی خۆیدا وتی: های های کابرا لە دەنکە گەنمێک خۆش نابێت کە بەدەم ڕێگاوە لە باری گوێدرێژەکە دەکەوێتەوە خوارەوە جا چۆن هیچی بۆ منێکی نەشناس وداماو لێدەبێتەوە؟! بۆیە هیچی پێنەوت و جارێکی تر بەشوێنی خۆیدا گەڕایەوەو هاتەوە بۆ لای هاوڕێکەی و پێی وت:

_ ماڵوێران، بەخوا ئەم چروکییەی تریشم پێوە دی، پێم وتیت کابرا ڕەزیلەو هیچی لێ هەڵناوەرێ، بەڵام تۆ هەر لەسەر قسەی خۆت سوربویت.

+ ئا تۆ بچۆ پەنایەوەو داوای لێ بکە، خۆ تۆ دوو جارە ئەچیت بۆ لای ماڵیان و هیچیش نادرکێنیت، من دڵنیام سکاڵای حاڵی خۆتی لەلا بکەیت نائومێدت ناکات.

لە ژێر فشاری هاوڕێکەیدا بە نابەدڵی جارێکی تر چویەوە بۆ بەردەم دەرگای ماڵی کابرای دەوڵەمەند، کە نزیکی ماڵیان بویەوە گوێی لێ بوو بە کچەکانی ئەوت چراکە کز بکەن با نەوتەکەی ناوی زوو تەواو نەبێت، لە دڵی خۆیدا وتی: ئەی قوڕی دنیام بەسەر، بەخوا بڕوا ناکەم ئەم شارە لەم پیاوە ڕەزیلترو چروکتری تیا بێت، خۆ هەتا دێت ڕژدتر دەردەکەوێت.

ئا لەو کاتەدا کابرای دەوڵەمەند دەرگای ماڵەکەی کردەوە تەماشا دەکات کەسێک لەبەر دەرگاکەیاندا وەستاوە، یەکسەر ڕوی دەمی تێکردو پێی وت: کارت چیە؟ ئەمە سێیەم جارە تۆ لێرەدا دەبینم.

کابرای هەژاریش وتی: گەر گوێم لێ بگریت ڕاستییەکەت پێ دەڵێم، هەژاری تەنگی پێهەڵچنیوم، هانام بۆ هاوڕێیەکم برد تەماشا ئەکەم ئەو لەمن وێرانترە، ڕێنوێنی کردم بۆ لای تۆ، وتی بچۆ خۆتی پێبگەیەنە بەدەستی بەتاڵ ناتگێڕێتەوە، جاری یەکەم هاتم تەماشام کرد سەرەڕای ئەو هەمووە مەڕوماڵاتە بێ شومارە کە چی خۆت بەدەستی خۆت خەریکی تیمار کردنی بزنە لاتێک بویت. جاری دووەم هاتم بە کوڕەکانت وت: ئەو دەنکە گەنمانەی لە باراشەکە دەکەونە خوارەوە بیانچننەوە، ئەوەتا ئێستاش بە کچەکانت وت چراکە کز بکەن با نەوتەکەی ناوی زوو تەواو نەبێت، سوێند بەخوا ئەمانەی لە تۆدا بینیم لە کەسی چروک و ڕەزیل نەبێت لە کەسی تر ناوەشێنەوە!

کابرا زەردەخەنەیەکی کردو وتی دەی مادام وایە تۆش تۆزێک گوێم لێ ڕادێرە، ئەو بزنە هەتا ساخلەم بوو شیری زۆرمان لێ ئەستاند، بەڕێشی تۆ ڕەوایە ئێستا کە نەخۆشە پشتگوێی بخەین و لێیگەڕێین بەدەم ئازارەوە بتلێتەوە!

فەرمانکردنیشم بە هەڵگرتنەوەی دەنکە گەنمەکان لەبەر ڕژدی و چاوچنۆکیم نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو مرۆڤ نازانێت بەرەکەت لە کام بەشی خواردنەکەیدایە، دەشێ بەرەکەت لەو چەنددەنکە گەنمەدا بێت کە لە بارەکەوە دادەکەون.

سەبارەت بە کزکردنی چراکەش، وەک دەزانیت من چەند کچێکم هەیە ئەمڕۆ بێت یان سبەی مێرد دەکەن و دەچنەماڵی خۆیان، دەکرێ مێردی یەکێکیان هەژارو دەست کورت بێت، ئەو توانا دارییەی من هەمە ئەو نەیبێت، بۆیە دەمەوێت هەر لە ئێستاوە کچەکانم فێر بکەم چۆن دەست پێوە بگرن!

کابرای هەژار کە ئەم قسانەی بیست حەپەسا، لە دڵی خۆیدا وتی بەخوا ئەم پیاوە تەنها باوک نیە، بەڵکو مامۆستاو ڕاهێنەریشە.

دەوڵەمەندەکە کە زانی کابرای هەژار واقی وڕماوە دەستی گرت و بردییە ژوورەوەو هەرچی پێویست بوو بەزیادەوە پێشکەشی کرد.

## " ئەوانەی شەرمیان کرد هەمویان سوتان "

دەگێڕنەوە: لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا لە وڵاتی شام گەرماوی گشتی هەبوو، خەڵک بۆی دەچون و بەئاوە گەرم و سابوناوە بۆنخۆشەکەی خۆیان دەشۆرد.

ڕۆژێک لە یەکێک لە گەرماوە گشتییەکاندا ئاگرێکی گەورە کەوتەوە، هەندێک لەوانەی لەناو گەرماوەکەدا بوون هەر بەڕوتی و بە سابوناوەکەوە لە ترسی ئاگرەکە دەرچوونە دەرەوە، هەندێکی تریان پێیان شەرم بوو بەڕوتوقوتی گەرماوەکە بەجێبهێڵن، هەتا ئاگرەکەیان پێگەیشت و هەموویان سوتان!

لە ناو شاردا پرسیار کرا: ئەرێ کێ بوون ئەوانەی سوتان؟

کابرایەکیش وەڵامی دایەوەو وتی: "ئەوانەی شەرمیان کرد هەموویان سوتان"

ئیتر لەو ڕۆژەوە ئەم وتە بووە بە پەندو ئەهلی شام ئێستاشی لەگەڵدا بێت دەیڵێنەوە.

## " لە شەڕی ئەو کەسە بترسە چاکەی لەگەڵدا دەکەیت "

دەگێڕنەوە: دارفرۆشێک هەبوو، هەرچەندە هەژارو نەدار بوو، بەڵام لەگەڵ هاوژینەکەیدا زۆر کامەران خۆش بەخت بوون، تەنها ئەوە نەبێت خوا منداڵی پێنەدابوون، شەوو ڕۆژ لەخوا دەپاڕانەوە کە منداڵێکیان پێ ببەخشێت، ساڵ دەهات و ساڵ دەچوو دارفرۆشەکە متمانەی بەخودا پتەوتر دەبوو، لە دووعا کردن کۆڵی نەدەدا، هەردەم چاوی لە ئایندە بوو، تا دواجار لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا ژنەکەی سکی دەبێت و خودا کوڕێکی چاوگەشیان پێ دەبەخشێت، دارفرۆشەکە لەخۆشیاندا هەر ئەوە نەبوو پەڕوباڵی لێ بڕوێت.

ساڵ هات و ساڵ ڕۆیشت کوڕەکە گەورە بوو، تەمەنی گەیشتە بیست ساڵ و باوکیشی تەمەنی گەیشتە حەفتا، کابرا نەخۆش کەوت و کەنەفتی سەر جێگا بوو، بانگی کوڕەکەی کردو هەندێک ئامۆژگاری کردو پێی وت:

کوڕم ناپاکی لە خوێن و دەماری مرۆڤەکانــدایە، چاکە لەگەڵ هەموو گیانلەبەرێکدا بکە، بەڵام لە ناویاندا بە ئاگاییەوە مامەڵە لەگەڵ مرۆڤەکاندا بکە، با هەمیشە ئەم پەندەت لە یاد بێت: "بترسە لە شەڕی ئەو کەسەی چاکەی لەگەڵدا دەکەیت"

زۆری نەبرد دارفرۆشەکە کۆچی دوایی کردو کوڕەکەیشی پیشەکەی باوکی هەڵگرتەوە.

ڕۆژێک لە ڕۆژان بە بارێک دارەوە لە دارستان دەگەڕایەوە، بینی مارێک لە خوێنی خۆیدا گەوزاوەو ململانێ لەگەڵ مەرگدا دەکات، ئەمیش لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە بۆ ماڵەوەو برینەکەی تیمار کردو پاش ماوەیەک بەتەواوی چاک بویەوە.

مارەکە گەلێک سوپاسی دارفرۆشەکەی کرد سەبارەت بەو چاکەو دڵسۆزییەی بەرامبەری نواندی، تاڵە موویەکی پێداو پێی وت: هەر کاتێک پێویستت بە من بوو ئەم تاڵە مووە بسوتێنە لەهەر شوێنێک بم خۆمت پێ دەگەیەنم، داوام لە

خودا ئەوەیە هەلێکم بۆ بڕەخسێنێت بۆ ئەوەی پاداشتی ئەم چاکەیەت بەزیادەوە بدەمەوە.

مارەکە ڕۆیشت بەڕێی خۆیەوە.

ڕۆژان هات و ڕۆژان ڕۆیی، کوڕەکە بە تەواوەتی قاڵبووبوو لە پیشەی دارفرۆشتنداو لەو ڕێگەیەوە بژێوی ژیانی خۆی و خانەوادەکەی دابین دەکرد.

ڕۆژێک لە دارستانەوە دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، گوێی لە نرکەو ناڵەی کەسێک بوو، بەشوێنی دەنگەکەدا ڕۆیشت تا گەیشتە سەری، تەماشا ئەکات کەسێکە خەڵتانی خوێنی خۆی بووە، بڕیاریدا هاوکاری بکات، لەو کاتەدا ئامۆژگارییەکەی باوکی بیرکەوتەوە " بترسە لە شەڕی ئەو کەسەی چاکەی لەگەڵدا دەکەیت" بەڵام لە دڵی خۆیدا وتی: ئەگەر ئەم بریندارەش شایانی چاکەو پیاوەتی نەبێت خۆ من شایانی چاکەو پیاوەتی کردنم! بەخوا ئەگەر باوکیشم زیندو بوایەو لەشوێنی مندا بوایە ئەوا ڕێگەی بەخۆی نەئەدا ئەم بریندارە بەم حاڵەوە بەجێبهێڵێ، بۆیە هەڵیگرت و بردییەوە بۆ ماڵەوە، تیماری برینەکانی کرد هەتا بەتەواوی چاک بوویەوەو وەک جاری جارانی لێهاتەوە.

داوای لە دار فرۆشەکە کرد کە لە ماڵەکەیدا بمێنێتەوە تا ئەوەندەی دەکەوێتە سەرپێی خۆی و کاروبارەکانی ژیانی ڕێک دەخاتەوە، بەڵێنی پێدا میوانێکی ڕۆح سوک و هاودەمێکی دڵسۆزو بە ئەمەک بێت، دارفرۆشەکەش بەم داوایە ڕازی بوو.

ڕۆژێک کچی پاشا لە باڵکۆنەکەی کۆشکدا دانیشتبوو خشڵ و زێڕەکانیشی لەپەنای خۆی دانابوو، لەناکاو باڵندەیەک هات و پڕی دایەو هەندێک لە خشڵ و زێڕەکانی ڕفاند، بردی بردی هەتا گەیشتە ڕێکی ماڵی دارفرۆشەکەو ئا لەوێدا بەریدایەوە بۆ خوارەوە، خەڵکیش چاویان لێ بوو ئاڵتون و خشڵەکان کەوتنە ناو حەوشەی ماڵی دارفرۆشەکەوە، هەواڵی شوێنی کەوتنەخوارەوەی خشڵەکان گەیەنرایە پاشا.

بەڕێکەوت ئەو کاتە دارفرۆشەکە لە ماڵ نەبوو، هەرکە باڵندەکە خشڵەکانی بەردایەوە میوانەکە هەڵیگرت و لە شوێنێکی قایمدا حەشاریدا!

پاشا بەداروودەستەکەی خۆی وت: جارێ چاوەڕوان بن بەڵکو دارفرۆشەکە بەبێ پێ وتن خۆی بیهێنێتەوە.

پاشا سێ ڕۆژ چاوەڕوانی کرد، نە دارفرۆش دەرکەوت و نە خشڵەکانیش گەڕێنرایەوە، بۆیە پاشا یەکێک لە فەرماندە سەربازییەکانی ڕاسپارد چەند کەسێک لەگەڵ خۆیدا ببات و دارفرۆشەکە دەستگیر بکەن.

دارفرۆشەکە توشی شۆک بوو کاتێک بینی جەندرمەکانی پاشا خۆیان کرد بەماڵەکەیداو قۆڵبەستیان کرد.

بەسەرسوڕمانەوە پرسیاری کرد: ئەرێ ئەوە من تاوانم چیەو لەسەر چی دەستگیرم دەکەن؟!

وەڵامیان دایەوە: چونکە تۆ دزیت

وتی: بەخوا هیچم نەدزیوە

لەو کاتەدا میوانەکە وتی: من حەز دەکەم قسە بکەم، بەڵام لە خاوەن ماڵ ئەترسم، ئەگەر جەنابی فەرماندە بەڵێن بدات پارێزگاریم لێ بکات ئەوا ژێر بەڕەی بۆ دەهێنمە سەر بەڕە!

فەرماندەکە وتی: ئەوا تۆ لە ئێستاوە لەژێر پارێزگاری ئێمەدایت و کەس بۆی نیە لە گوڵ کاڵترت پێ بڵێ.

میوانەکە چووە ژوورەوە، زۆری پێ نەچوو هاتەوەو خشڵەکانیشی لەگەڵ خۆیدا هێناو وتی: کاتێک باڵندەکە خشڵەکانی بەردایەوە ئەم دارفرۆشە هەڵیگرتەوە، هەرچەند هەوڵم لەگەڵداو ئامۆژگاریم کرد کە ئەمە سپاردەی پاشایەو نابێت دەستی بۆ ببرێت، بەڵام گوێی لێ نەگرتم و ناپاکی لە سپاردەکەی پاشای گەورەمان کرد، دارفرۆشەکەیان ڕاپێچی زیندان کرد، دواتر پاشا بڕیاریدا بەدیار چاوی هاوشارییانەوە قامچی لێ بدرێ و پاشان شاربەدەریش بکرێت.

لەو کاتەدا دارفرۆشەکە هاوڕێ مارەکەی بیرکەوتەوە، تاڵە مووەکەی دەرهێناو سوتاندی، ئەوەندەی پێنەچوو مارەکە خۆی گەیاندە لای و ئامادەی خۆی دەربڕی بۆهەر ئەرکێک کە پێی بسپێرێت، دارفرۆشەکە چیرۆکی خۆی بۆ مارەکە گێڕایەوە، ئەویش وتی:

خەمت نەبێت بەزوترین کات لەم گێژاوەی کە میوانەکەت تێی خستوی دەربازت دەکەم، وا ئێستا ئەچم خۆم دەئاڵێنم لە گەردن و ملی کچی پاشا هەتا تۆ پێم نەڵێت لێی نابمەوە.

هێندە توند خۆی لە گەردنی کچی پاشا ئاڵاند خەریک بوو بیخنکێنێ، پاشا هەرچی پزیشک و جادوبازو پەروەردەکارانی مار هەبوو هەمویانی کۆکردەوە بەڵام هیچیان پێنەکرا، بەتایبەتی ئەوان ترسیان لەوە بوو کە ئەگەر فشار بۆ مارەکە بهێنن بە کچی پاشاوە بدات، ئەوکات قوڕەکە خەستتر دەبێتەوە.

دارفرۆشەکە ڕوداوەکەی لە زاری پاسەوانانی بەندینخانەوە بیست، بەتوندی لە دەرگای بەندینخانەکەیداو وتی: من ئەتوانم ئەو مارە لە گەردنی کچی پاشا بکەمەوە، دەرگاکەم بۆ بکەنەوە ئەمەوێت پاشا ببینم!

دەرگای بەندینخانەیان لێ کردەوەو بردیان بۆ لای پاشا، وتی جەنابی پاشا من ئەتوانم کچەکەت لەو تەنگەژە ڕزگار بکەم، بەڵام منیش کۆمەڵێک مەرجم هەیە دەبێ جێبەجێیان بکەیت!

پاشا پرسی مەرجەکانت چین؟! دارفرۆشەکە وتی:

١ـ ئەو مارە دوای ئەوەی لە گەردنی کچەکەت بوویەوە نابێت کەس دەستی بۆ درێژ بکات و بیکوژێت، بەڵکو دەبێت ڕێگای بۆ ئاچوخ بکرێت بۆ ئەوەی بچێت بەڕێی خۆیەوە.

٢ـ چیرۆکی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە دەبێت باوەڕم پێ بکەیت، سوێند بەو کەسەی ئەم دیدارەی تۆی بەبێ ئەرک و ماندوبوون بۆ من ڕێکخست یەک پیت درۆت لەگەڵ ناکەم.

٣ـ ئەبێت کچەکەی خۆتم لێ مارە بکەیت.

پاشا بە ناچاری بە هەموو مەرجەکان ڕازی بوو.

دارفرۆشەکە لە مارەکە نزیک بویەوەو دەستێکی پیا هێنا یەکسەر لە گەردنی کچەکەی پاشا بویەوە، بەبێ ئەوەی هیچ کەسێک دەستی بۆ درێژ بکات بەخێرایی بەرەو دەرەوەی کۆشک ڕێگای گرتەبەر.

دوای ئەوە دارفرۆشەکە چیرۆکی خۆی بۆ پاشا گێڕایەوەو باسی ئەوەی بۆ کرد کە چۆن ئامۆژگارییەکەی باوکی پشت گوێ خستووەو ئەم دەردی سەرییەش کە دوچاری بووە دەرەنجامی چاکەیەک بوو کە بەرامبەر کەسێک کردی، پاشان سوێندی بۆ خوارد کە دورو نزیک ئاگای لە خشڵەکان نەبووە، بۆیە پاشا داوای کرد میوانەکە بدۆزنەوەو لە بەندینخانەی توندبکەن.

دواجار پاشا کچەکەی خۆی لێ مارە کردو پێکەوە درێژەیان بە ژیانی پڕ لە خۆشی و کامەرانیدا.

# " ئەمین و مەئمون "

دەگێڕنەوە: شەوێک هارونە ڕەشیدو زوبەیدە خاتوونی هاوژینی لە باڵەکۆنی کۆشکدا پێکەوە دانیشتبون و قسەوباسیان دەکرد، زوبەیدە دەستی کرد بە تاریف و پەسن کردنی ئەمینی کوڕی، یەکە یەکە سیفەت و تایبەتمەندییەکانی هەڵدا، زیرەک، خانەدان، وریاو چاپوک، چاونەترس، ورەبەرز...

هارونە ڕەشیدیش وتی: ئەمانەی تۆ باسیان دەکەیت لە کەسایەتی مەئموندا بونیان هەیە نەک ئەمین.

مشتومڕ لە نێوانیاندا دروست بوو، زوبەیدە خانم ئەیوت ئەم سیفەتانە سیفەتی ئەمینن، هاورنە ڕەشیدیش ئەیوت: نەخێر، هی مەئمونن.

هارونە ڕەشید وتی: دەی من قسەی خۆمت بۆدەسەلمێنم!

لەشەوی دواتردا هارونە ڕەشید بانگی هەردو کوڕەکەی کرد بۆ باڵەکۆنەکەو پێکەوە هەتا درەنگانێکی شەو دەمەتەقێیان کرد، پاشان پێی وتن: شەومان بە نیوە گەیاند با ئیتر بڵاوەی لێ بکەین، پاش کەمێک هارونە ڕەشید بانگی زوبەیدەی هاوژینی کردو ئەویش ئامادە بوو، پاشان بانگی دەرگاوانەکەی کردو پێی وت: بانگی ئەمین و مەئمونم بۆ بکە، زۆری نەبرد ئەمین بەجلوبەرگێکی نەرم و تەنکەوە، بە بۆن و بەرامەیەکی خۆشەوە خۆی گەیاندە لای باوکی، دوای کەمێک مەئمونیش هات، بەڵام بەجلوبەرگی جەنگەوە، شمشێرەکەی کردبوو بەلاقەدیەوەو ڕمەکەیشی بەدەستەوە گرتبوو!

هارونە ڕەشید وتی: کوڕم ئەوە چی وای لێ کردیت بەم نیوە شەوە بەجلوبەرگی سەربازی و بەکەرەستەی جەنگەوە بەدەم بانگهێشتەکەمەوە بێیت؟!

مەئمونیش لە وەڵامدا وتی: باوکە گیان من تۆزێک پێش ئێستا کۆڕەکەی تۆم بەجێهێشت، ئەگەر کارێکت بەمن هەبوایە ئەو کات پێت ڕادەگەیاندم، کە بەم

نیوە شەوە ناردت بەدوامدا گومانم برد شتێکی نەخوازراو ڕوی دابێ و منت بۆ کارێکی بەپەلە پێویست بێت؛ بۆیە دەستوبردم کردو خۆم سازو تەیار کرد، بۆ ئەوەی جارێکی تر نەگەڕێمەوە بۆ خۆئامادە کردن و کاتم لێ بچێت، خۆ ئەگەر کارەکەش زۆر جێی بایەخ و گرنگی پێدان نەبوو ئەوا لابردنی ئەم جلو بەرگ و چەکوچۆڵانە کەی کارێکی هێندە ئەستەمە. هارونە ڕەشید تەماشایەکی زوبەیدەی کردو پێکەنینێکی بۆ کردا!

# " سوڵتانێکی ژیر "

دەگێڕنەوە: کابرایەک هەبوو بەتەما بوو گەشتێک بکات بۆ شوێنێکی دوور، هەرچی پارەو پولی هەبوو لەلای بازرگانێکی ناو بازاڕ بە ئەمانەت داینا، بەو مەرجەی هەرکە لە گەشتەکەی گەڕایەوە ڕادەستی بکاتەوە.

ڕۆژان هات و ڕۆژان ڕۆیشت، کابرا لە گەشتەکەی گەڕایەوە، چوو بۆ لای بازرگانەکە بۆ ئەوەی پارەو پولەکانی لێ وەربگرێتەوە، بەڵام بازرگانەکە نکوڵی لێ کردو وتی: هیچت لەلای من دانەناوە.

کابرا بەم هەڵوێستەی بازرگانەکە تەواو شپرز بوو نەیئەزانی چی بکات، هەندێک لە هاوڕێکانی پێشنیاریان بۆ کرد بچێت بۆ لای قازی و سکاڵا تۆمار بکە، بەڵکو ئەمە خوایە قازی بڕیارێک لە بەرژەوەندی دەربکات.

بەڵام باوکی کابرا کە ژیان زۆر شتی فێر کردبوو، سەری سپی و بیر کردنەوەیشی فراوان کردبوو وتی: ڕۆڵە لە دادگادا سکاڵاکار لەسەریەتی شایەت بێنێ و سکاڵا لێکراویش سوێند بخوات، ئەوەتا تۆ شایەتت نیەو ئەویش سوێند دەخوات، کەواتە ئەم هەنگاوە هەنگاوێکی نەزۆکەو هیچی لێ شین نابێت، من پێم باشە خۆت بچیت بۆ لای سوڵتان و بەشێنەیی تێیبگەیەنیت بەڵکو ئەو کارێکت بۆ بکات و مافی خۆتت بۆ وەربگرێتەوە.

کابراچوو بۆ لای سوڵتان، سەرەتا مۆڵەتی لە دەرگاوان خواست و خۆی کرد بەژوردا، لەبەردەمی سوڵتاندا وەستاو چیرۆکی خۆی بۆ گێڕایەوە، پاشان وتی: نەچوم بۆ لای قازی چونکە شایەتم نەبوو، شایەتی من تەنیا خوایە، هەموو ڕێگایەکم لێ بەستراوە، دەستم لەبەرودوا بڕاوە، لە پاش کەرەمی خوا کەس شک نابەم تۆ نەبێ.

سوڵتان وتی: دیارە هاوڕێکەت تەڵەکەبازە، بۆیە دەبێ تەڵەی بۆ دابنرێت. سبەینێ بچۆ لەبەردەم دوکانەکەیدا بوەستە، منیش بە کەژاوەی خۆم و وەزیرو پاسەوانەکانمەوە بەو گوزەرەدا تێدەپەڕین، لائەدەم و سەلامت لێ دەکەم، گلەیت لێ دەکەم کە بۆ وەک جاران نایەیت بۆ کۆڕو کۆبونەوەکانمان، تۆش گوێمان پێمەدەو خۆت زۆر سەخڵەت مەکە.

بۆ سبەینێ لە کاتی دیاری کراودا چووە بەردەمی دوکانی بازرگانەکە، زۆری نەبرد سوڵتان بە خۆی و کەژاوەی سەربازو پاسەوانەکانیەوە بەوێدا تێپەڕین، هەرکە سوڵتان کابرای بینی یەکسەر لە ئەسپەکەی دابەزییە خوارەوەو باوەشی پیاکردو ئەملاو ئەولای ماچ کرد، دوای چاکی و چۆنی پێی وت: هاوڕێی ئازیز دەمێکە تامەزرۆی دیدارتین، ئەوە بۆ دیار نیت؟! گلەیی بێ لێت وەک جاران بەسەرمان ناکەیتەوە، دەمێکە لە هاوڕێیەتی و قسە خۆشەکانت بێ بەشین. ئەم ماریفەتەی سوڵتان ترس و بیمێکی زۆری لە دڵی کابرای بازرگاندا دروست کرد.

کابراش وتی: بەخوا ماوەیەکە سەرقاڵم و هەندێک کێشەو ئاریشەم بۆ پێش هاتووە، کاتم لە بەردەستدا نەبوو، بەڵام بەڵێن بێت دەرفەتێکم بۆ بڕەخسێت دێمە دیدارتان!

بازرگانەکە کە ئەمەی بینی دۆشداماو ترس و بیمێکی زۆر باڵی کێشا بەسەریدا.

دوابەدوای ئەوەی سوڵتان بەخۆی و دارودەستەکەیەوە ئەو ناوەیان بەجێهێشت بازرگانەکە بەهەڵە داوان خۆی گەیاندە لای کابراو سپاردەکەی بۆ گەڕاندەوەو پێی وت: تۆ بی و خودا نەکەی ئەوەی لە نێوانماندا گوزەرا بۆ سوڵتان باس بکەیت، کابرا پارەو پولەکەی خۆی وەرگرتەوەو گەڕایەوە بۆماڵەوە.

# " ڕیشی لەبێخدا ببڕن "

دەگێڕنەوە: لە سەردەمی حەزرەتی سولەیماندا باڵندەیەک چوو بۆ گوێی چەمێک بۆ ئەوەی ئاو بخواتەوە، تەماشا ئەکات کۆمەڵێک منداڵ لە نزیک چەمەکەوە یاری دەکەن، لە دڵی خۆیدا وتی منداڵ بزێوە ئەترسم بچمە سەر چەمەکەو بەڵایەکم بەسەردا بێنن، نەوەڵا باشتر وایە لە دوورەوە چاوەڕوانی بکەم هەتا منداڵەکان ئەو ناوە چۆڵ دەکەن ئەوجا بچمە سەر ئاوەکەو بەبێ ترس و لەرز تێر ئاو بخۆمەوە.

ئەوەندەی پێ نەچوو منداڵەکان بڵاوەیان لێ کرد، هەر دوابەدوای منداڵەکان پیرە مێردێک بەڕیشێکی سپی و درێژەوە هات بۆ سەر چەمەکە کە نیشانەی ویقارو شکۆمەندی لە نێو چاوانیدا دیار بوو، باڵندەکە وتی: ئەم پیرە مێردە نورانییە جێگای ترس نیە؛ چونکە بەم ڕیشە سپی و درێژەیەوە لە سۆفیە دنیا نەویستەکان دەچێت.

چووە سەر ئاوەکە بۆ ئەوەی ئاو بخواتەوە پیرە مێردەکە بەردێکی هەڵگرت و پێوەی پێچا چاوێکی باڵندەکەی کوێر کرد، باڵندەکە بەهەڵەداوان خۆی گەیاندە لای حەزرەتی سولەیمان و سکاڵای تۆمار کرد.

سولەیمان فەرمانی کرد ئەو پیرە مێردەی بە قۆڵبەست کراوی بۆ بهێنن ، هێنایان و گوێی لە هەردولا گرت، پاشان بڕیاریدا لە تۆڵەی چاوی باڵندەکە چاوێکی پیرەمێردەکە دەربهێنن، بەڵام باڵندەکە هەر زوو هاتە دەنگ و وتی: ئەی پەیامبەری خودا واز لە چاوی بێنە، چاوی هیچ تاوانێکی نیە، بەڵکو فەرمان بکە با ڕیشی لە بێخدا ببڕن، سوێند بەخوا من فریوی ڕیشە درێژو سپییەکەیم خوارد ئەگینا نەئەکەوتمە داوییەوە.

# " هێی کەچەڵ "

دەگێڕنەوە: جارێک کابرایەکی کەچەڵ مێرد منداڵێک دەگرێت و تێر فەلاقەی دەکات، کەسوکاری منداڵەکەش لەلای قازی سکاڵا لەدژی کابرای کەچەڵ تۆمار دەکەن.

کابرایان هێنایە بەردەمی قازی و پرسیاری لێکرد: بۆ لەو مێردمنداڵەت داوە؟!

وتی: قوربان تۆ جارێ سەڵاواتێک لە سەر پێغەمبەر لێبدە

قازی وتی: باشە، اللهم صل علی محمد وعلی آل محمد

کەچەڵەکە وتی: سڵاواتێکی تریش لێبدە

قازی دووبارە وتی: اللهم صل علی محمد وعلی آل محمد

کەچەڵەکە وتی: ئەمجارەش سڵاواتێکی تر لێبدە

قازی بۆ جاری سێیەم ناوچاوانی گرژ کردو ویستی هەڵوێست وەربگرێت

کەچەڵەکە وتی: جەنابی قازی من تەنها سێ جار شتێکم لێ دووبارە کردیتەوە شتەکەش سڵاواتدان بوو لە دیداری حەزرەت ئەوەتا ناوچاوت گرژ کردووەو خەریکە جامی تووڕەیی خۆتم بەسەردا دەڕێژیت، ئەم مێردمنداڵە هەر جارێک بەلایدا تێدەپەڕم سەرقاڵی هەر شتێک بێت وازی لێ دێنێ و شوێنم دەکەوێت و بانگم دەکات: هێی کەچەڵ، هێی کەچەڵ، هێی کەچەڵ.

ماوەیەکی زۆر ڕققی خۆمم خواردەوەو کاردانەوەم بەرامبەری نەبوو، بەڵام ئەمڕۆ پەتی سەبرم پچڕاو بەدڵی خۆم کەرکوتێکی باشم کرد.

قازی دەستی کرد بە پێکەنین و بە کەسوکاری مێرد منداڵەکەی وت: هەر منداڵێک لەماڵەوە باوک و دایکی تەمبێی نەکەن لە دەرەوە تەمبێی دەکەن، پاشان قازی کەچەڵەکەی ئازاد کردو چوو بە ڕێی خۆیەوە.

# " حەکیم و دەردەدار "

دەگێڕنەوە: حەکیمێک هەبوو خوای گەورە بەهرەیەکی وای پێدابوو بەبێ ئەوەی زانستی پزیشکی خوێندبێ چارەسەری هەموو نەخۆشییەکی دەکرد، دەرمانەکانی دەخستە ناو شوشەو لەسەر ڕەفەی ئەو ژورەی کە تیایدا پێشوازی لە نەخۆشەکان دەکرد دادەنا.

ئەوەی لە هەمووی سەرنج ڕاکێشتر بوو ئەوە بوو هەر نەخۆشێک سەردانی بکردایە یەکێک لە شوشەکانی سەر ڕەفەکە دەلەریـیەوە، ئیتر پێش ئەوەی نەخۆشەکە دەم بدرێتەوەو باسی نەخۆشییەکەی خۆی بکات ئەم ئەیزانی دەردەکەی چیەو دەرمانەکەیشی چیە!

هەر لەوێدا دەرمانەکەی پێ دەداو بە ویستی خوا چاک دەبویەوە.

ناوو ناوبانگی ئەم حەکیمە بەهەموو شوێنێکدا بڵاو بویەوە، خەڵک لەهەموو لایەکەوە دەهاتنە سەردانی.

ماوەیەکی زۆر بەم شێوەیە هەر نەخۆشێک بهاتایە یەکێک لە شوشەکانی سەر ڕەفەکە دەلەرییەوە.

ڕۆژێک نەخۆشێک هات بۆ لای زۆر لەرو لاواز بوو ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا بوو کێشی تەواو دابەزیبوو ، تەماشایەکی نەخۆشەکەی کردو لایەکی بەلای ڕەفەکەدا کردوە هیچ کام لە شوشەکان نەلەرینەوە.

حەکیمەکە پێی وت: کاکە چارەسەری ئەم نەخۆشییەی تۆ لەلای من دەست ناکەوێت!

نەخۆشەکە بە نائومێدییەکی زۆرەوە لای حەکیمەکەی بەجێهێشت و دڵنیا بوو لەوەی ئەم نەخۆشییە لە نزیکترین کاتدا کۆتایی بەژیانی دێنێت، ئەو حەکیمەی کە دەرمانی هەموو دەردێکی لەلایە، ئەوەتا دەستەوسانە لە ئاستی نەخۆشییەکەی ئەمدا.

کابرای نەخۆش خەمێکی قوڵ باڵیکێشا بەسەریدا ، بڕیاریدا سەری خۆی هەڵگبرێت و بچێت لە ساراو چۆڵەوانیداو دور لە چاوی کەسوکاری بمرێت، پێی خۆش نەبوو بە مردنەکەی خەم و پەژارە بخاتە دڵی هیچ کەسێکەوە!

کابرا ڕۆیشت... زۆر ڕۆیشت بەناو ساراو چۆڵەوانیدا هەتا تەواو شەکەت و ماندو بوو، پشتی نا بە پیرە دارێکەوە، چاوەڕوانی عیزائیلی دەکرد بێت و گیانی بکێشێت.

لەو کاتەدا شوانێک بەخۆی و مەڕومالاتەکەیەوە بەوێدا تێپەڕی، کە تەماشای کرد زۆر بەزەیی پیایدا هاتەوە، وتی ئەم کابرا برسێتی تەواو بڕستی لێ بڕیوە، مەڕێکی گرت بۆ ئەوەی بیدۆشێ و کەمێک شیری دەرخوارد بدات، بەڵام هیچی پێ نەبوو شیرەکەی دابدۆشێتە ناوی، تەماشایەکی ئەملاو ئەولای خۆی کرد تەنها ڕوفاتی مرۆڤێکی بەدی کرد کە لەو ناوەدا بەبێ نازی مردبوو، ناچار کەللە سەرەکەی هێناو شیری مەڕەکەی دادۆشییە ناوی هەتا پڕ بوو، خستیە بەردەستی کابرای نەخۆش و چوو بەلای مەڕو مالاتەکەیەوە.

کابرای دەردەدار ویستی دەست بۆ شیرەکە ببات و بیخواتەوە لەولاوە مارێک لە بنی تاشە بەردێکەوە ملی ناو پێش ئەم خۆی گەیاندە شیرەکەو هەمووی خواردەوە، ئەمیش بەردێکی هەڵگرت بیپێچێت بەمارەکەوە، لە ترسان مارەکە هەرچی خواردبوو هەموی هەڵهێنایەوەو ڕشایەوە ناو کەللە سەرەکە، کابرا تەماشایەکی شیرەکەی کرد بینی تێکەڵی ژەهری مارەکە بووە، لە دڵی خۆیدا وتی: خۆ من هەر دەمرم هەر دەمرم، بەتێری بمرم باشترە نەک بەبرسێتی، چاوی نوقاندو شیرەکەی نا بەسەرەوە هەتا چۆڕەی لێ بڕی، چاوەڕوان بوو دەست بەجێ گیان بسپێرێت!

بەڵام کە چاوی کردەوە توشی شۆک بوو کاتێک بینی ئەو شەوەی هەتا بەیانی بە خەوێکی قوڵ بەسەر بردووە بەبێ ئەوەی هەستی بە ئازاری شەوانی ڕابووردو کردبێت، بێهێزی و لاوازییەکەی جارانی نەما بوو، کەوتە گومانەوە تۆ بڵێی ئەمە خەو بێت؟ نقورچکی توندی لە خۆی دەگرت بۆ ئەوەی دڵنیا بێت کە ئەمە بێدارییەو خەو نیە، پاش ئەوەی کەمێک لە شۆک و حەپەسانەکەی نیشتەوە هەستایە سەر پێ و دەستی کرد بە ڕۆیشتن هەتا گەیشتە گۆماوێک، تۆزێک لە ئاوەکەی خواردەوەو تەماشایەکی ناو گۆماوەکەی کرد وێنەی خۆی تێدا بینیەوە، تێبینی کرد ڕەنگ زەردییەکەی جارانی نەماوە، بەپەلە گەڕایەوەو خۆی گەیاندە لای حەکیمەکەو پێی وت: خۆ تۆ وتت دەردەکەت بێ دەرمانە!

حەکیمەکەش لەوەڵامدا وتی: من نەموت دەردەکەت بێ دەرمانە، بەڵکو وتم دەرمانی دەردەکەت لە لای من دەست ناکەوێت.

دەرمانی تۆ شیری شەک مەڕێکە کە تێکەڵ کرابێ لە گەڵ ژەهری مارێکی نەسمراودا لە ناو کەللە سەری کچێکی شو نەکردودا، من ئەم شتانە لە کوێ بێنم و چۆن دەستیان بخەم؟! پێم بڵێ بزانم ئەمانەت چۆن چنگ کەوت؟!

کابراش وردو درشتی چیرۆکەی خۆی بۆ گێڕایەوە، حەکیمەکە بە سەرسامیەوە بەکابرای وت: ئەوەی حەکیمی زەوی نەیتوانی بۆتی بکات حەکیمی ئاسمان بە ئاسانی بۆی کردیت، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە جڵەوی هەموو شتەکانی لەدەستدایە.

# " بشکێم بەڵام نەزرێم "

دەگێڕنەوە: بازرگانێـک هەبـوو دوای ئەوەی بیسـتبوی بـازاڕی شـاری عەککـا بازاڕێکی گەرمەو بازرگانان تیایدا قازانجێکی زۆرو بێشوماریان چنـگ دەکەوێـت؛ بۆیە ئەمیش بڕیاریدا بە مەبەستی بازرگـانی کـردن سـەرێکی ئەو شـارەو بـازاڕە بەناوبانگەی بدات، گەیشتە ئەوێ و پـێش ئەوەی خـۆری ئەو ڕۆژەی لـێ ئـاوا ببێ باری هەموو وڵاخەکانی فرۆشتن و پێنج لیرەی ئاڵتونیش قازانجی کرد.

بازرگانە غەوارەکە گەلێـک خۆشـحاڵ بـوو بەم قـازانجە زۆرە، بەڵام لە دڵـی خۆیدا وتی: ئەگەر بەم پارە زۆرەوە بگەڕێـمەوە دوور نـیە لە ڕێگـادا دزو جەردە بموەستێنن و ڕوتم بکەنەوەو هەرچیم پێیە بەزۆر لێم وەربگرن و قازانج سەری بن مایە بخوات.

چاوێکی گێڕا بە دەوروبەری خۆیـدا بازرگـانێکی بینـی کە سـەرو سـیمای لە پیـاو خراپـی نەدەکـرد، ئەو خەڵکەیشـی کە بەو گـوزەرەدا تێـدەپەڕین سـڵاوی گەرمیان لێ دەکردو بە چاوی ڕێزەوە تەماشایان دەکرد، چوو بۆ لای و پێی وت: هەندێک پارەو پولم پێیە ئەمەوێت بە ئەمانەت لەلات دایبنێم، ئەویش ڕازی بـوو بەڵێنیشی پێدا ئەمانەتەکەی وەک بیلبیلەی چـاوی خـۆی بپـارێزێ و هەر کـات بۆی هاتەوە ڕادەستی بکاتەوە.

پاش ماوەیەک کابرا گەڕایەوە بۆ ئەوەی سپاردەکەی وەربگرێتەوە، بەڵام شـکڵ و شـێوەی ئەو بازرگـانەی کە ئەمـانەتەکەی لەلا دانـابوو بـاش لەبیـر نەمـابوو، شوێنی دوکانەکەیشی ون کردبوو، هەرچی ئەکـرد نەئەچـوویەوە سـەری. لە نـاو بـازاڕدا هەر ئەهـات و هەر ئەچـوو هەتـا بازرگـانێکی بەدی کـرد کە شـێوەو ڕوخساری زۆر نزیک بوو لە شێوەو ڕوخساری ئەو بازرگانەی کە سپاردەکەی لەلا دانابوو، وای زانی ئەوە ئەوە، چوو بۆ لای، لەو کاتەدا ئەو کەسـە لەگەڵ چەنـد

بازگانێکی تری هاوڕێی دانیشتبون و خەریکی مامەڵەو کڕین و فرۆشتن بوون لەگەڵ یەکتریدا، پێی وت: ماوەیەک پێش ئێستا پێنج لیرەی ئاڵتونم بە ئەمانەت لەلات دانا، وا ئێستا بۆی هاتومەتەوە، بازرگانەکە بەزەردەخەنەوە تەماشایەکی کابرای کردو تورەکەی پارەکەی دەرهێناو پێنج لیرەی ئاڵتونی خستە ناو مشتییەوە!

بازرگانە غەوارەکە تۆزێک دوور کەوتەوە، کاتێکی زانی خۆی لەبەردەم دوکانی ئەو پیاوەدا بینیەوە کە سپاردەکەی لەلا دانابوو، زۆر سەری لەوە سوڕما ئەرێ باشە ئەو بازرگانەی تر چۆن وا بە ئاسانی ئەو پارە زۆرەی خستە مشتیەوە بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی بە ئەمانەت لەلا دانابێ!

خۆی کرد بە دوکانی بازرگانەکەداو پێنج لیرەکەی خۆی لێوەرگرتەوە، ئەوجا گەڕایەوە بۆ لای بازرگانی یەکەم، تەماشا ئەکات بە تەنها لە دوکانەکەیدا دانیشتووە، لێی چووە پێشەوەو سەلامی لێ کردوو ئەویش لەبەری هەستاو بەگەرمی بەخێری هێنا، پاشان پێی وت: ئەمرۆ شتێکی یەکجار سەیرم لە تۆ دی، من هەندێک پارەم لەلای بازرگانێکی ئەم بازاڕە بە ئەمانەت دانا بوو، ئەمرۆ هاتم بۆ ئەوەی وەریبگرمەوە، وام زانی تۆ ئەوی، داوای پارەکەم لێ کردیتەوە، تۆش بەبێ چەندوچوون پارەکەت خستە مشتمەوە، پاشان تۆزێک چوومە ئەولا ترەوە کاتێکم زانی خۆم لە بەردەم دوکانی ئەو کابرادا بینیەوە کە پارەکەم لەلا دانابوو، باشە ئەوا من لێم تێکچوو ئەی تۆ بۆ ئەو پارە زۆرەت بەخوتوخۆڕایی خستە مشتی منەوە؟!

بازرگانەکە زەردەخەنەیەکی کردو وتی: ئەو کاتەی کە تۆ هاتیت و داوای سپاردەکەت کردەوە من لەگەڵ چەند بازرگانێکی تری هاوڕێمدادانیشتبووین و خەریکی سەوداو مامەڵە بوین، ئەگەر ئەو کات نکوڵیم لێ بکردایەو بموتایە سپاردەی تۆ لەلای من نیە ئەوا لەلای ئەوان یان ئەوە بوو متمانەی خۆم ل

دەست دەداو وەک کەسێکی ناپاک لێیان دەڕوانیم. یان لانیکەم درۆزنگ و دڵکرمین دەبوون بەرامبەرم. کەسی بازرگانیش هەر ئەوەندەی لەناوبازاڕدا ناوی زڕا ئیتر خەڵکانی تر سڵی لێ دەکەنەوەو بە ئاسانی متمانە بەدەست ناهێنێتەوە. بۆیە ئەوەی من کردم کڕینەوەی ناوبانگی خۆم بوو بە پێنج لیرە، کە پێم وایە لەم مامەڵەیەدا قازانجێکی کەمم نەکردووە.

بازرگانە غەوارەکە پێنج لیرەکەی بۆ گەڕاندەوەو پاشان دوکانی کابرای بەجێهێشت و هەر بیری لەژیری و دانایی ئەو بازرگانە دەکردەوە!

## " سولەیمان پێغەمبەر و مێرولە "

دەگێڕنەوە: سولەیمان پێغەمبەر مێرولەیەکی دی دەنکە گەنمێکی ڕادەکێشا، سەری سوڕما ئەم مێرولە بەم قەبارە بچوکەی خۆیەوە چۆن دەتوانێت ئەم بارەی کە چەند قات لە کێشی خۆی قورسترە هەڵبگرێت!

پرسیاری لە مێرولەکە کرد: ساڵی چەند دەنکە گەنم دەخۆیت؟

وتی: ساڵی دوو دەنکە گەنم ئەی پێغەمبەری خودا

سولەیمان پێغەمبەر مێرولەکەی هەڵگرت و خستیە ناو سندوقێکەوەو دوو دەنکە گەنمیشی خستە ناوییەوە.

پاش ساڵێک سندوقەکەی کردەوە تەماشا ئەکات یەک دەنکە گەنمی خواردووەو دەنکەی تری دەم پێوە نەداوە.

سولەیمان پێی وت: ئەی تۆ نەتوت ساڵی دوو دەنکە گەنم دەخۆم، کەچی ئەوتا یەک دەنکە گەنمت خواردووە؟!

مێرولەکە وتی: ئاخر قوربان هەتا لەو دەشت و سارایە بووم ڕزق و ڕۆزیم لەلای خودا بوو، دڵنیا بووم لەوەی خودا هەرگیز لە بیرم ناکات، بەڵام کاتێک ڕزقم کەوتە لای تۆ ترسام لەبیرم بکەیت؛ بۆیە دەستم پێوە گرت و پاشەکەوتم کرد.

سولەیمان پێغەمبەر زەردەخەنەیەکی کردو سەراسیمە بوو لە ژیری و دانایی ئەم مێرولەیە.

## " تۆ گۆرانیت وت و منیش هەڵپەڕیم "

دەگێڕنەوە: جارێک وشترێک و گوێدرێژێک پێکەوە لە دەست خاوەنەکەیان بەرەو چۆڵەوانی هەڵهاتن،ڕوویان لە شوێنێکی مێرگ و ئاودار کرد، ماوەیەکی باش لەو شوێنەدا مانەوە، لە گیای سەوزیان دەخواردو لە ئاوی سازگاریان دەخواردەوە، ئیتر ڕەنگ و ڕویان هاتەوە، خشپن و قەڵەو بوون، تەندروستیان ڕوی لە باشی کرد، ئاسەواری هیلاکی و ماندوو بوون بە جەستەو ڕوخساریانەوە ڕەوییەوە.

ڕۆژێک گوێدرێژەکە تێروپڕ لە گیای تەڕو سەوز لەوەڕا بوو، چوو بووە بن سێبەری دارێکەوەو بە وشترەکەی وت:

حەزم لێیە گۆرانی بڵێم!

وشترەکە وتی: نەکەی ناماقوڵی وا بکەیت، خۆت ئەزانیت پیاوانی سوڵتان بە شوێنی وڵاخی باربەری بەرەڵادا ئەگەڕێن بۆ ئەوەی بیانگرن و بێگارییان پێ بکەن، مەردی خوابە ئەم خۆشییەمان لێ تێک مەدە، بەخوا هەر بە ئاستەم دەنگت لێ بەرز بێتەوە یەکسەر ئەماندۆزنەوەو ئیتر دەگەڕێینەوە بۆ دۆخی جاران و مەینەتی و کوللە مەرگی جارێکی تر دەست پێدەکاتەوە.

گوێدرێژەکە ڕق گرتی و وتی: هەر دەیلێم چی دەبێ با ببێ!

وشترەکە وتی: بەخوا وا دیارە ناشکوریت و جووتە لە نانی خۆت ئەدەیت.

گوێدرێژەکە دەستی بە زەڕین کردو تیمە گەڕۆکەکانی پیاوانی سوڵتانیش گوێبیستی زەڕەی گوێدرێژەکە بوون، بەشوێنی دەنگەکەدا هاتن و دۆزینیانەوە، گرتنیان و بردنیان، ئیتر ڕۆژانە هەر لە بەرەبەیانێکی زووەوە هەتا خۆر ئاوا بوون باریان پێ دەهێنان و باریان پێ دەبردن، ئێوارەش تەنها گوێلێک کای وشک و قومە ئاوێکی لیخنیان دەخرایە بەر.

## " تۆ گۆرانیت وت و منیش هەڵپەڕیم "

دەگێڕنەوە: جارێک وشترێک و گوێدرێژێک پێکەوە لە دەست خاوەنەکەیان بەرەو چۆڵەوانی هەڵهاتن، روویان لە شوێنێکی مێرگ و ئاودار کرد، ماوەیەکی باش لەو شوێنەدا مانەوە، لە گیای سەوزیان دەخواردو لە ئاوی سازگاریان دەخواردەوە، ئیتر ڕەنگ و ڕویان هاتەوە، خشپن و قەڵەو بوون، تەندروستیان ڕوی لە باشی کرد، ئاسەواری هیلاکی و ماندوو بوون بە جەستەو ڕوخساریانەوە ڕەوییەوە.

ڕۆژێک گوێدرێژەکە تێروپڕ لە گیای تەڕو سەوز لەوەڕا بوو، چوو بووە بن سێبەری دارێکەوەو بە وشترەکەی وت:

حەزم لێیە گۆرانی بڵێم!

وشترەکە وتی: نەکەی ناماقوڵی وا بکەیت، خۆت ئەزانیت پیاوانی سوڵتان بە شوێنی وڵاخی باربەری بەرەڵادا ئەگەڕێن بۆ ئەوەی بیانگرن و بێگارییان پێ بکەن، مەردی خوابە ئەم خۆشییەمان لێ تێک مەدە، بەخوا هەر بە ئاستەم دەنگت لێ بەرز بێتەوە یەکسەر ئەماندۆزنەوەو ئیتر دەگەڕێینەوە بۆ دۆخی جاران و مەینەتی و کوللە مەرگی جارێکی تر دەست پێدەکاتەوە.

گوێدرێژەکە ڕق گرتی و وتی: هەر دەیلێم چی دەبێ با ببێ!

وشترەکە وتی: بەخوا وا دیارە ناشکوریت و جووتە لە نانی خۆت ئەدەیت.

گوێدرێژەکە دەستی بە زەڕین کردو تیمە گەڕۆکەکانی پیاوانی سوڵتانیش گوێبیستی زەڕەی گوێدرێژەکە بوون، بەشوێنی دەنگەکەدا هاتن و دۆزینیانەوە، گرتنیان و بردنیان، ئیتر ڕۆژانە هەر لە بەرەبەیانێکی زووەوە هەتا خۆر ئاوا بوون باریان پێ دەهێنان و باریان پێ دەبردن، ئێوارەش تەنها گوێلێک کای وشک و قومە ئاوێکی لیخنیان دەخرایە بەر.

ڕۆژێـک لەگەرمەی ئیشـکردندا گوێـدرێژەکە خـۆی وا پیشـاندا کە زۆر مانـدو شەکەتەو لە ڕۆیشتن وەستا، هەرچەندِ تێیان خوڕی و لێیاندا بێ سود بوو، پاش ئەوەی لێی بێ هیوا بوون بەناچاری دایان بەکۆڵی وشترەکەدا!

وشترەکەش زۆر پەست و توڕە بوو، وشـتر بەوە ناسـراوە لە هەر باردوخێکـدا بێت تۆڵەی خۆی هەر دەکاتەوە.

وشــترەکە بە گوێــدرێژەکەی وت: هــاوڕێی ئــازیز زۆر تــامەزرۆی دەنــگە زولاڵەکەتم، بۆ تۆزێک گورانیم بۆ ناڵێی؟

گوێدرێژەکە ئەم داوایەی زۆر پێخۆش بـوو؛ بـۆیە یەکسـەر دەنگی هەڵهێنـاو دەستی کرد بە زەڕین، وشترەکەش دەستی کرد بە پشت هەڵتەکاندن، وەک ئەوەی سـەماو هەڵپەڕکـێ بکـات، گوێـدرێژەکە خـۆی نەگـرت بەسـەر پشـتیەوەو کەوتە خوارەوەو هەر چوار پەلی شکا، بەدەم هـاوارو نـاڵەوە هەر ئەیـوت: بـۆ وات لـێ کردم، بۆ منت خستە خوارەوە؟

وشترەکەش وتی: "تۆ گۆرانیت وت و منیش هەڵپەڕیم"

## " لە شیر دەمی سوتاوە و فوو لە دۆ دەکات "

دەگێڕنەوە: جارێک پیاوێک ژنەکەی داوای لێدەکات بچێت بۆ بـازاڕ گۆشـتی بۆ بکڕێت و بەخێراییش بۆی بهێنێتەوە.

پیاوەکەش وتی: بەسەر چاو، توزێکی تر لەبەردەستتدا دەبێت

ژنەکە وتی: بڵێ ئینشائەڵلا _ ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێ _

پیاوەکە وتی: ژنەکە ئینشائەڵلای بۆ چیە، پارە لە بەرکمدایەو بازاڕیش نزیکە

کابرا چوو بۆ بازاڕ بۆ گۆشت کڕین، لەوێ دزێک فرسـەتی لـێ هێنـاو بەبـێ ئەوەی بەخۆی بزانێ پارەکەی لێ دزی ، چووە دوکانی گۆشت فرۆشکە، دەستی کرد بە بەرکیدا تەماشا ئەکات هیچ پارەی تێدا نـیە، ئیتـر زانـی دز گـۆڵی لـێ کردووە، بە دەستی بەتاڵ گەڕایەوە بـۆ مـاڵەوەو لە دەرگایـدا، ژنەکەی لە دورەوە هاواری کرد: کێی؟ وتی: "منم ئینشائەڵلا"

# " ڕێوی تەڵەکە باز "

دەگێڕنەوە: جارێک ڕێوییەک لە نیوە شەودا خۆی ئەکات بەناو پەچەیەکدا بۆ قەل و مریشک خواردن، خاوەنی پەچەکە پێی دەزانێت و دەرگای پەچەکەی لەسەر کلۆم دەدات، ئەچێت بۆ ئەوەی تەورداسێکی تیژی بۆ بێنێ و ئەنجن ئەنجن بکات!

ڕێوییەکە ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاو هەموو گیانی کەوتە حەشۆکەو لەرزین، بەڵام هەر چۆنێک بوو ورەی دایە بەر خۆی و وتی: ئەم کاتە کاتی ترس و بیم نیە،کاتی بەکار هێنانی فرت و فێڵ و خۆ قوتار کردنە. "برسێتی ئەتخاتە داو، فێڵ ڕزگارتەکا وەک پیاو"

بەهەڵەداوان خۆی گەیاندە لای گاجووت و پێی وت:

"ئەی گاجوتی قوڕبەسەر، بەشخوراوی دەربەدەر، کەژو چیاو دەشت و کۆ، هەموویان کێڵا بەتۆ"

باشە تۆ بۆ بیرێک لە خۆت ناکەیتەوە، خاوەنەکەت بە زۆری گۆچان و قامچی ملکەچی هەموو کارێکی سەخت و دژواری کردویت، ئیتر با جنێو و سوکایەتی پێکردنیش لەولاوە بوەستێت، ئەمە لە کاتێکدایە گاجوتەکانی تری هاوڕێت بەرەڵای دەشتودەرن، لە تەڕ ئەخۆن و لە وشک ئەنوون. بۆ نایەیت شاخ بگیرێنیتە ئەو دەرگایە لە بن و بێخی بێنی و خۆت و ئێمەش ڕزگار بکەیت.

گاجووت پێی وت: وازم لێ بێنە ڕێوی تەڵەکەباز، خاوەنەکەم هەتا بڵێی کەسێکی دڵ ڕەق و بێبەزەییە، ساڵی پار شاخەکانی شکاندم نامەوێ ئەمساڵیش سەرم ببڕێت و گۆشتەکەم بە ئاواییدا ببەخشێتەوە، ئەمەی تۆ ئەیڵێی بە من ناکرێت، بەرۆکم بەردەو بچۆ بۆ لای یەکێکی تر.

ڕێوییەکە تەماشایەکی ئەملاو ئەولای خۆی کردو گوێدرێژی بەدی کرد، چوو بۆ لای و پێی وت: "کەری هەژارو داماو، لە ئاژەڵان بەجێماو، ڕەنجی تۆ ئەدەن بەبا، پێشت ناگا ئاشتەبا" تۆ ئەو هەمووە ڕەنج و ماندو بوونە لە پێناوی خاوەنەکەتدا ئەکێشیت کەچی ئەو لەبەر چاوی نیەو قسەی هەرە شیرینی نەقیزەو هەچە هەچەیە، هەستە ئەم ژیانە بە نەفرەت بکەو شانت بگیرێنە ئەو دەرگایەو لە ڕەگ و ڕیشەی دەربێنە، هەم ئێمەو هەم خۆیشت ڕزگار بکە.

گوێدرێژەکە وتی: وازم لێبێنە ڕێوی جامباز توشی قەباحەتێکم مەکە، من هەر لە ئەزەڵەوە خودا بۆ باربەری و سوار بوونی دروستی کردووم، لێمگەڕێ با بەدەردی خۆمەوە دابسەکنم!

ڕێوی لە ئەمیش بێ هیوا بوو، چاوێکی تری گێڕایەوە ئەم جارە هێستری بینی، چوو بۆ لای و سڵاوێکی شاهانەی لێ کردو پێی وت: حەیفێ بۆ چنگی کاو کۆتەڵی وشک وازت لەو هەمووە لەوەڕو پاوانەی دەشتودەر هێناوە، چووە بنکلێشەی و بەردەوام قسەی بۆ کرد تا فریویداو هەڵهاتنی لەلا جوان و شیرین کرد، هێسترەکە هەستاو ملی کرد بەدەرگاکەدا لە کرێژەنەی ترازاندو ڕێگەی هەڵهاتنی ئاچوخ کرد.

هەرچی ئاژەڵی ناو پەچەکە هەبوو هەموویان هەڵهاتن وڕوویان لە دارستان کرد، ڕێویش لەم نێوەندەدا ڕۆڵی چاوساغی دەبینی، هەواڵی بەلەسە بوونی ئاژەڵان بۆ ناودارستان بە چاوساغی مام ڕێوی شێری زۆر تووڕەو نیگەران کرد، ڕێوی بانگ کردو بە تووڕەییەوە پێی وت: چۆن زاتت کرد بەبێ مۆڵەت ئەم هەمووە ئاژەڵ و ماڵاتە بەربدەیتە ناو خاک و مەملەکەتی منەوە ؟!

ڕێوی وتی: پاشای دارستان بیستم کە نەخۆشیت، ناوی دەرمانێکم لایە بۆ نەخۆشییەکەی تۆ یەکاویەکە.

شێر وتی: بیڵێ بزانم چیە؟

ڕێوی وتی: قوربان ناوی دەرمانەکە لە سەر سمی هێسترەکە نوسراوە، خوێندەوارییەکەی من وەک ئەوەی جەنابتان بەهێز نیە تا بۆتانی بخوێنمەوە، هێسترەکە سمی بەرز کردەوەو شێرەکەش سەری نەوی کرد بۆ ئەوەی بیخوێنێتەوە، لەو کاتەدا هێسترەکە فرسەتی هێنا جوتەیەکی لە شێرەکە داو گرمۆڵەی کرد، پاشان بە پێلەقەش چووە سەری، ڕێویکەش پەلاماریداو دەستی کرد بە گاز لێ گرتنی.

شێرەکە وتی: تەنانەت تۆش ئەی ڕێوی؟!!!

ڕێویش لە وەڵامیدا وتی: "کێ لە سەرەوە بێت من لەگەڵ ئەوەم"

## " ئەمەوێ شێر بی و ببەخشی، نەك ڕێوی بی و چاو لە مست بی "

دەگێڕنەوە: بازرگانێکی زۆر دەوڵەمەند هەبوو کە خاوەنی تاقە کوڕێک بوو، لەبەر ئەوەی کوڕەکەی بەناز پەروەردە کردبوو، هەم تەمبەڵ و تەوەزەل بوو، هەم ماڵ بەفیڕۆدەرو دەست بڵاویش بوو، بەڕاست و چەپدا پارەی باوکی تەخشان و پەخشان پێدەکرد.

باوکەکە زۆر سەراسیمەو نیگەران بوو لە ئەتوارو هەڵسوکەوتی کوڕەکەی، حەزی ئەکرد هەست بە بەرپرسیارێتی بکات، ئەو خاوەنی تەنها ئەو کوڕەیە، دواجار ئەو پارەوپولەی کەلەپێناویدا ساڵانێکی زۆری تەمەنی بەخەرجداوەو ئارەقی زۆری بۆ ڕشتووەو شەونخونی زۆریشی لەهەمبەر کێشاوە بۆ ئەو دەبێت، زۆر سەخت بوو بەلایەوە ئەورەنج و ماندو بوونەی تەمەنی بەبا بچێت.

زۆری بیر کردەوە، پلان و بیرۆکەی زۆی تاوتوێ کرد بۆ ئەوەی کوڕەکەی بهێنێتەوە هۆش خۆی و بیخاتەوە سەر ڕێگە ڕاست و دروستەکە، تا دواجار ئەو بیرۆکەیەی پەسەند کرد کە سەرۆکاری کاروانێکی بازرگانی پێبسپێرێ و چەند کەسێکی لێهاتوو شارەزایشی لەگەڵدا بنێرێت بۆ چاودێری کردن و یارمەتی دانی، ئیتر ئەو کات بەری ڕەنجی خۆی دەخوات و نرخی کارکردن دەزانێت و هەست بەبونی خۆیشی دەکات، کە بینی پارە بە چ دەردو چەرمەسەرییەک پەیدا دەکرێت ئیتر بە فیرۆی نادات و تەخشان و پەخشانی پێ ناکات.

ئەم بیرۆکەی لە لای کوڕەکەی باس کردو ئەویش پەسەندی کردو چاکی لێکرد بە لاداو کاروانیان بەسەرۆکایەتی کوڕەکەی بەڕێخست، ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە لە ڕۆیشتنی بێوچاندا بوون، گەلێک شەکەت و ماندو بوون، کە شەو داهات وەک نەریتی هەر کاروانییەکی تر بۆ پشودانی خۆیان و وڵاخەکانیان لە شوێنێکدا بارگەو بنەیان خست، ئەو شەوە بە ئارامی لێ نوستن، زەوی ڕایەخ و

ئاسمانیش پەتویان بوو، کوڕەکە دیمەنی جوان و ڕازاوەی سروشت و شەوی دلڕفێنی بیابان تەواو مەست و مەدهۆشی کرد بوو!

لە بەرەبەیانێکی زودا، لەو کاتەی کاروانییەکە لە سەروبەندی خۆ ئامادە کردندا بوون بۆ ڕۆیشت کوڕەکە شتێکی سەیرو سەرسوڕهێنەری دی، شێرێکی بینی کە کەروێشکێکی بەدەمەوە بوو، لەبەردەم ئەشکەوتێکدا دایناو لێیدا ڕۆیشت!

زۆری نەبرد لە ئەشکەوتەکەوە ڕێوییەکی کوێر هاتە دەرەوەو دەستی کرد بە ملۆموش کردن هەتا نێچیرەکەی دۆزییەوە، خواردی و پاشان گەڕایەوە بۆ ناو ئەشکەوتەکە!

کوڕەکە لە دڵی خۆیدا وتی: باشە خۆ خوای گەورە خۆی ڕزق و ڕۆزی بۆ هەموو گیانلەبەرێک دەنێرێ ئیتر ئەم خەڵکە بۆ خۆیان هیلاک و ماندو دەکەن، ئەو خوایەی ڕێوییەکی کوێر لە بیر نەکات ئێمەی چاو زەق چۆن لەبیر دەکات، فەرمانی کرد کاروانییەکە بە شوێنی خۆیدا گەڕایەوە!

باوکەکە زۆری پێ سەیر بوو کوڕەکەی لە ناوەندی ڕێ گەڕایەوە، پرسیاری هۆکارەکەی لێ کرد.

وتی باوکە گیان ئەوەی منی گەڕاندەوە بینینی شتێکی سەیرو سەمەرە بوو.

چیت دی کوڕم بۆم باس بکە.

وتی باوکە گیان شێرێکم دی کەروێشکێی ڕاو کردبوو، هێنای و لە بەردەم ئەشکەوتێکدا دایناو ڕێویەکی کوێری هات و خواردی، باوکە گیان هەموومان ڕزقی خۆمان دێتە بەردەستمان ئیتر بۆچی خۆمانی بۆ شەکەت و ماندو بکەین!

باوکەکە زەردەخەنەیەکی کردوو وتی: کوڕی شیرینم ڕاستە خودا ڕزقی هەموو گیانلەبەرێک دەنێرێت، بەڵام من ئەمەوێت تۆ شێری چاوساغ بیت و ببەخشیت، نەک ڕێوی کوێر بیت و وەربگریت.

کوڕەکە لە ئامانج و مەبەستەکەی باوکی تێگەیشت و بڕیاریدا بۆ لەمەولا لە ئیشوکارکردن نەوەستێت و ئەتواری جارانیشی بەیەکجاری واز لێ بێنێ.

## " ڕێوی بەستییەوە، مشك كردییەوە "

دەگێڕەوە: شێرێک فەرمانڕەوایی دارستانێکی دەکرد، ئیتر بە ئارەزووی خۆی دەسوڕایەوەو حوکمی قەرەقوشی خۆی تیادا پیادە دەکرد، بەشی ئەمی ئەدا لە ئەوی ئەگرتەوە، فلانی سزا ئەدا فیساری ئەبەخشی، ماوەیەکی باش بەم شێوەیە گوزەراندی، تا دواجار لەم شێوە ژیانەی خۆی قەڵس و بێزار بوو.

ڕۆژێک هەروا لەبەر خۆیەوە بیری دەکردەوە: ئەرێ خۆمن بە تەواوی تەمەنی خۆمم فەوتاند، ڕۆژانە بەکاروباری دانیشتوانی ئەم دارستانەوە خەریک و سەرقاڵم، دوان سکاڵا لە دژی یەکتری تۆمار دەکەن دەبێ داوەری لە نێوانیاندا بکەم، دەبێتە مشتومڕو دەمەقاڵێیان ئەبێ پێکیان بهێنمەوە، من تەنها بۆ ئەو خەڵکە دەژیم و خۆمم بەتەواوی فەرامۆش کردووە، ستەم لە خۆم ئەکەم کە لەم زەمینە پان و بەرینەدا جگە لەم دارستانە بچوکە شوێنێکی ترم نەدیوە!

بڕیاریدا دارستانەکە بەجێبهێڵێ و بەجێیشیهێشت...

ڕۆیشت زۆر ڕۆیشت تا ڕێی لە دەشتێکی فراوان و کاکی بەکاکی کەوت، زۆر هیلاک و ماندو بوو، تینوێتی و برسێتی هێزی لێچنی بوو، چەمێک لەو نزیکانە بوو خۆی گەیاندێ و تێر ئاوی لێ خواردەوە، پاشان بۆ پشودان چووە بن سێبەری دارێکەوە، ڕێوییەک بەو گوزەرەدا تێپەڕی، سەلامێکی لێ کردو ئەمیش بە گەرمی وەڵامی سەلامەکەی دایەوە.

پاشان ڕێوییەکە بە شێرەکەی وت: خۆ ئەم گوریسە ئەبینی کە پێمە، حەز ئەکەم بەم گوریسە بمبەستیتەوە بۆ ئەوەی بزانم پاشای دارستان چۆن خەڵک دەبەستێتەوە!

شێرەکەش گوریسەکەی لێ وەرگرت و زۆر بە توندی شەتەکیدا، هەر ئەوە نەبوو پەراسوی چەپ و ڕاستی بچێت بەیەکدا، بەڵام هاوسەنگی خۆی پاراست و دانی بەخۆیدا گرت،وای پیشاندا کە خۆ ڕاگرو بەهێزە.

دوای بەستنەوەکە شێرەکە بەڕێویکەی وت: خۆ دیت پاشای دارستان چۆن خەڵک دەبەستێتەوە.

ڕێوییەکە وتی: بەڵێ دیم، بەڵام ئەمجارە نۆبەی منە، بمکەرەوە با منیش پیشانت بدەم ڕێوی چۆن خەڵک دەبەستێتەوە!

ڕێوییەکە گوریسکەی وەرگرت و بەتوندی لە شێرەکەی پێچا، بەڵام ئەمەی ڕێوییەکە کردی بەستنەوە نەبوو بەڵکو هەڵواسین بوو، پاشان بەو حاڵەوە شێرەکەی بەجێهێشت و لێداو ڕۆیشت!

شێرەکە هەر چەند نەڕاندی و خۆی ڕاوەشاندو هەڕەشەو گوڕەشەی کرد، ڕێوییەکە ڕۆیشت و هەر لایشی بەلایدا نەکردەوە.

لەو کاتەدا بەڕێکەوت مشکێکی بچوک بەوێدا تێپەڕی، کە شێرەکەی بینی بەو حاڵەوە پێی وت: پاشای دارستان یارمەتیت ناوێت؟

شێرەکە وتی: تۆیەکی گچەو بێ هێز لە کوێ یارمەتی منت پێ ئەدرێت!

مشکەکە وتی: لە بچوکییەکەمەوە لێم مەڕوانە، خوا دەسەڵات و توانای خۆی لە بەدیهێنراوە لاوازو بچوکەکانیدا پیشان دەدات، دەستی کرد بە قرتاندنی گوریسەکە تا شێرەکەی ڕزگار کرد، شێرەکەش زۆر سوپاسی کردو لێدا ڕۆیشت.

مشکەکە وتی: ئۆغر بۆ کوێ ئەکەیت پاشای دارستان؟

شێرەکە وتی: بۆ دارستانەکەی خۆم... شوێنێک تیایدا ڕێوی بتبەستێتەوەو مشک بتکاتەوە شوێنی دانیشتنی من!

# " وەزیرەکەی سولەیمان پێغەمبەر و فریشتەی گیانکێشان "

دەگێڕنەوە: فریشەی گیان کێشان دۆست و هاوڕێی سولەیمان پێغەمبەر بوو، زوو زوو لە شێوەی پیاوێکدا سەردانی دەکردو بەشداری کۆڕو دانیشتنەکانی دەکرد، تا وای لێهاتبوو خەڵک لێی نەدەترسان و سڵیان لێ نەدەکردەوە.

جارێک فریشتەی گیانکێشان هات بۆ لای حەزرەتی سولەیمان، لەو کاتەدا یەکێک لە وەزیرەکانی لە خزمەتیدا بوو، فریشتەی گیانکێشان بەدیقەتەوە چاوی بڕیبووە وەزیرەکە، هاوکات نیشانەی عاجباتی بە ڕوخسارییەوە دیار بوو، پاشان فریشتەی گیانکێشان کۆڕەکەی بەجێهێشت و لێیدا ڕۆیشت.

وەزیرەکە پرسیاری ئەو پیاوەی کە لە کۆڕەکەدا چاوی لێ کلا نەدەکرد لە حەزرەتی سولەیمان کرد، ئەویش فەرموی: ئەوە فریشتەی گیان کێشان بوو!

هەرکە وای وت وەزیرەکە هەموو گیانی کەوتە حەشۆکەو لەرزین، بە حەزرەتی سولەیمانی وت:

تکات لێ دەکەم فەرمان بکە بە با هەڵمبگرێت و بمبات لە وڵاتی هیندستان دامبنێت، ناتوانم لە شوێنێکدا دابنیشم کە تیایدا فریشتەی گیانکێشان بە دیقەتەوە چاوی تێبڕیبم!

سولەیمانیش فەرموی: زیندەوەران لە بەردەم فریشتەی گیانکێشاندا وەک خواردەمەنیەکانی سەر سفرە وان، کامەی مەبەست بێت دەستی پێدەگەیەنێ، نە دوورکەوتنەوە تەمەن درێژ دەکات نە مانەوەش کەمی دەکاتەوە.

بەڵام وەزیرەکە لە پاڕانەوە کۆڵی نەدا هەتا دڵی حەزرەتی سولەیمانی نەرم کرد، فەرمانی بە با کرد بیگەیەنێتە وڵاتی هیندستان!

پاش کەمێک فریشتەی گیانکێشان هاتەوە، حەزرەتی سولەیمان لێی پرسی: ئەرێ بۆ سەرنجی وردت خستبووە سەر ئەو وەزیرەی من؟!

وتی: خوای گەورە فەرمانی پێ کردم پاش کەمێکی تر بچم لە وڵاتی هیندستان گیانی بکێشم، کە هاتمە لای تۆو ئەوم دی وتم: باشە ئەم کابرا کە هێندەی نەماوە بە دنیاوەو بڕیار وایە لە وڵاتی هیندستان گیانی بکێشم چی دەکات لێرە؟! هەرچەند دڵنیا بووم لەوەی هەر شتێک خودا بڕیاری لێ بدا هەر ئەوە جێبەجێ دەبێ، کە چوومە هیندستان تەماشا ئەکەم ئەو پێش من گەیشتووەو لە چاوەڕوانی مندایە!

❁ ❁ ❁

# " قازییەکی ژیر و دانا "

دەگێڕنەوە: دوو بـرا هەبـوون کە هاوکـات دراوسـێی یەکتـریش بـوون، هەر یەکەیان خودا لە شتێکدا بەشی دابـوو، یەکێکیـان زۆر دەوڵەمەنـد بـوو بەڵام لە منداڵ بێ بەش بوو، ئەوی تریان کۆشێک منداڵی هەبوو بەڵام هەژارو نەدار بوو.

دەوڵەمەندەکە بەدخوو چاوچنۆک بوو، هەژارەکەش خۆش ڕەفتارو زمان شیرین بوو.

کاتێـک بـرا دەوڵەمەنـدەکە دەگەڕایەوە بـۆ مـاڵەوە برازاکـانی بەخەنـدەو بەڕاکـردنەوە دەچـوون بەپیـرییەوەو باوەشـیان بە قاچیـدا دەکـرد، کەچـی ئەو تەنانەت بە وشەیەکیش دڵی ئەم منداڵانەی خۆش نەدەکرد، بەوە زۆر پەسـت و خەمبارو بوو کە براکەی منداڵی هەیەو ئەم نیەتی.

ماوەیەکی زۆر بارودۆخ بەم شێوەیە بەردەوام بوو، تـا ڕۆژێـک کـابرای هەژار منداڵەکانی وڕکی گۆشتی لێدەگرن، ئەویش ئەچێت بۆ لای برا دەوڵەمەندەکەی و پێی ئەڵێ:

نییەتی خۆت خاوێن بکەرەوەو بڕیار بدە ئەگەر خودا منداڵێکی پێ بەخشیت تۆش مەڕێک بە منداڵەکانی من ببەخشیت.

وتی: بەڵێن بێت ئەگەر خودا ئەوەی لەگەڵ کـردم مەڕێـک دیـاری خـۆت و منداڵەکانت بێت.

برا هەژارەکە شەوو ڕۆژ دەم بە نزا بوو، تا دوا جار براژنەکەی سکی دەبێ و خودا منداڵێکی چاو گەشیان پێدەدا.

چوو بۆ لای برا دەوڵەمەندەکەی و پێی وت: ئێستا کـاتی جێبەجـێ کردنـی بەڵێنەکەتە، بەڵام ئەو هەر پێچی تێدەداو دەستی دەستی پـێ دەکـرد، کوڕوکـاڵی کابرای هەژار چوونە ناو پەچەی مەڕوماڵاتەکەی و شەکبەرانێکی قەڵەویان هێنـا کە بە هەقی خۆیان دەزانی، سەریان بڕی و گۆشتەکەیان خوارد.

بۆ بەیانی کابرای دەوڵەمەند هات و دەستی کرد بە ژماردنی مەڕەکانی تەماشا ئەکات دانەیەکی کەمە، ئیتر زانی ئەمە کاری براکەیەتی.

لەلای قازی سکاڵای لە سەر براکەی تۆمار کرد، قازیش ئاگادارینامەیەکی بۆ براکەی ناردو تیایدا کات و شوێنی دادگایی کردنەکەی پێ ڕاگەیاند.

لە ڕۆژی دیاریکراودا هەردولایان توێشوی سەفەریان پێچایەوەو بە جیا ملی ڕێگان بەرەو شار بۆ لای قازی گرتەبەر.

لە ناوەڕاستی ڕێگادا برا دەوڵەمەندەکە گەیشتە دارفرۆشێک کە گوێدرێژەکەی بە بارەکەیەوە تا بناگوێی لە قوڕدا چەقیبوو، دۆش دامابوو بەدیارییەوە، داوای یارمەتی لێکرد کەچی هەر لایشی بەلایدا نەکردەوە، دواتر هەژارەکە گەیشت، داوای یارمەتی لە ئەمیش کرد، مەردانە قۆڵی لێ هەڵماڵی وبەدەمییەوە هات، هەژارەکە کلکی گوێدرێژەکەی گرت و دارفرۆشەکەش سەری گوێدرێژەکە، پێکەوە بە توندی ڕایانکێشا، کلکی گوێدرێژەکە بەدەستی کابرای هەژارەوە قرتا.

دارفرۆشەکە وتی: گوێدرێژەکەت عەیبدار کردم، بەخوا لەلای قازی سکاڵات لە دژ تۆمار دەکەم، کابرای هەژار بەدڵی پڕ لە پەژارەو خەمەوە ڕووەو شار درێژەی بە ڕۆیشتنەکەیدا، جاران یەک ساڵای لەسەر بوو ئێستا بوو بەدووان.

گەیشتە ناو شار، پێش ئەوەی بچێت بۆ لای قازی چوو بۆ مزگەوت بۆ ئەوەی نوێژی نیوەڕۆ بکات و لەوێشەوە هەندێک نزاو پاڕانەوەی بەکوڵ بکات.

بانگبێژی مزگەوتەکە ئەو ڕۆژە نەخۆش بوو، داوای لە هەژارەکە کرد سەرکەوێتە سەر بانگگە(منارە)کەو لە جیاتی ئەو بانگی نیوەڕۆ بدات، ئەویش چووە سەر بانگگەکەو بەدەم بانگدانەوە ڕەتی بردو بەربویەوە، کەوت بەسەر کەسێکداو کوشتی، کەسوکاری کوژراوەکە بۆی هاتن و پەلاماریاندا بۆ ئەوەی تۆڵەی لێ بکەنەوە، بەڵام ڕێبوارانی ئەو گوزەرە کەوتنە نێوانیانەوەو نەیانهێشت، برای کوژراوەکە بڕیاریدا لەلای قازی سکاڵا تۆمار بکات.

پێش گەیشتنی کابرای هەژار هەر سێ سکاڵاکارەکەی تر ، براکەی خۆی، خاوەنی گوێدرێژەکە، برای کوژراوەکە خۆیان گەیاندبووە لای قازی و لە چاوەڕوانی ئەمدا بوون.

کە گەیشتە لای قازی تەماشا ئەکات سێ سکاڵای جیاوازی لە سەر تۆمار کراوە، دادگایی کردن دەستی پێ کرد.

قازی سەرەتا بانگی برا دەوڵەمەندەکەی کردو پێی وت:سکاڵات چیە لەسەر ئەم پیاوە؟

وتی: جەنابی قازی سکاڵام ئەوەیە: چووەتە ناو پەچەی مەڕوماڵاتەکەمەوەو شەکبەرانێکی قەڵەوی لێ دزیوم!

قازی بەهەژارەکەی وت: ئەی تۆ قسەت چییە؟

وتی: جەنابی قازی سەرەتا با ئەوە ڕاست بکەمەوە کە ئەوەی کەشەکبەرانەکەی دزی خۆم نەبووم بەڵکو منداڵەکانم بوون، پاشان ئەم برایەی من بێ منداڵ بوو، بڕیاریداگەر خودا منداڵێکی پێبەخشی ئەوا مەڕێک بکاتە دیاری و پێشکەشی منداڵەکانی منی بکات بۆ ئەوەی سەری ببڕن و گۆشتەکەی بخۆن، کاتێک خودا منداڵەکەی پێدا نەهات بەڵێنەکەی جێبەجێ بکات، ئەوانیش چوونە ناو پەچەی مەڕوماڵاتەکەیەوەو ئەوەی بەڵێنی پێدابوون هێنایان و سەریان بڕی.

قازی بە دەوڵەمەندەکەی وت: ئەوەی براکەت دەیڵێ ڕاستە؟

وتی: بەڵێ جەنابی قازی ڕاستە، خۆ من هەر دەمویست ئەو مەڕەیان پێبدەم، بەڵام دوای دڵنیا بوون لەوەی کە ئەم منداڵە تەمەنی درێژ دەبێت.

قازی وتی: من وای بۆ دەچم ئەو منداڵەی کە خوای گەورە دوای چاوەڕوانییەکی زۆر پێی بەخشیت لەبەر خاتری ئەو برازایانەت بوبێت. بۆیە

ئەوا بڕیارماندا شەکبەرانێکت بۆ بێننەوەو تۆش منداڵەکەتیان بۆ بگێڕیتەوە،خۆ ئەگەر ئەوەش ناکەیت ئەبێ لە جیاتی ئەو منداڵە سەد لیرەی ئاڵتونیان پێ ببەخشیت.

بەناچاری ملی بۆ بڕیارەکەی قازی کەچ کردو سەد لیرەی کاشی نایە مشتی براکەیەوە، کە لیرەکانی لەدەست بوویەوە وەک ئەوە وابوو رۆحی لە جەستەی جیا بوبێتەوە، ئاخر ئەو بۆ ئەوە هاتبوو مەڕەکەی وەربگرێتەوە کەچی سەد لیرەیشی خستە سەری.

پاشان قازی ڕوی کردە خاوەنی گوێدرێژەکەو پێ وت: بچۆرە پەنای نەیارەکەتەوەو سکاڵای خۆت پێشکەش بکە.

خاوەنی گوێدرێژەکە وتی: جەنابی قازی ئەم کابرا کلکی گوێدرێژەکەی ڕاکێشام و قرتاندی، قەرەبوی ئەو زیانەم ئەوێت کە بەر گوێدرێژەکەم کەوتووە.

قازی بە کابرای هەژاری وت: ئەی قسەی تۆ چیە؟

وتی: قوربان من بەلای ئەم پیاوەدا تێپەڕیم، گوێدرێژەکەی لە قوڕدا چەقی بوو، زۆر هەوڵیدا دەری بکات بەڵام نەیتوانی، داوای یارمەتی لێکردم، ئەو سەری گوێدرێژەکەی ڕاکێشاو منیش کلکی، کاتێکم زانی کلکی بەدەستمەوە هات و قرتا.

قازی بە خاوەنی گوێدرێژەکەی وت: ئەوەی ئەم پیاوە دەیڵێ ڕاستە؟

وتی: بەڵێ قوربان ڕاستە.

قازی وتی: ئەوا بڕیارماندا گوێدرێژەکەتی بدەیتێ تا ئەو کاتەی جارێکی تر کلک دەردەکاتەوە.

خاوەنی گوێدرێژەکە وتی: من بەبێ ئەم گوێدرێژە دەستەپاچە دەبم و هیچ کارێکم بۆ ناکرێت.

قازی وتی: دەی کەواتە دەبێ پێنج لیرەی ئاڵتونی پێ بدەیت لە پای ئەو هاوکارییەی کەپێشکەشی کردویت، هەر وەها لە سزای ئەوەی کە ویستوتە چاکەو پیاوەتی لە نێوان خەڵکیدا بمرێنیت!

پاشان قازی بانگی برای کوژراوەکەی کردو پێی وت: لە پەنای نەیارەکەتەوە بوەستە و سکاڵای خۆت پێشکەش بکە.

وتی: جەنابی قازی ئەم کابرا لە سەربانگکە(منارە)ی مزگەوتەکەوە بەربووەتەوەو کەوتووە بەسەر براکەمداو کوشتویەتی.

قازی بە هەژارەکەی وت: ئەوەی ئەم کابرا دەیڵێ ڕاستە؟

وتی جەنابی قازی: بانگ بێژی مزگەوتەکە داوای لێ کردم بچمە سەر بانگگەکەو بانگ بدەم، چومە سەرەوە، هەڵەنگوتم و کەوتم بەسەر براکەیداو مرد.

قازی بە برای کوژراوەکەی وت: ئەوەی ئەم کابرا ئەیڵێ ڕاستە؟

وتی: بەڵێ، بێ زیادو کەمە.

قازی وتی: ئەوا بڕیارماندا تۆیش سەرکەویتە سەر بانگگەکەو خۆتی بەسەردا بەربدەیتەوە، بەم شێوەیە دەیکوژیت و تۆڵەی براکەتی لێوەردەگریتەوە!

وتی جەنابی قازی: بانگگەکە زۆر بەرزە، خۆ ئەگەر ئامانجەکە نەپێکم، سەر یان خوار بکەم ئەو کات خۆم دەمرم.

قازی وتی: دەی کەواتە دەبێ بڕی دە لیرەی پێبدەیت بۆ ئەوەی بزانیت تەمەن بەدەستی خوایەو لە سەر دەستی هەر کەسێک مەیلی لێ بێ کوتایی پێ دێنێ.

هەژارەکە هەموو لیرەکانی وەرگرت و بەدڵخۆشی و بە گیرفانی پڕەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە.

# " پیاوە قۆڵبڕ و سێ برا گەمژەکە "

دەگێڕنەوە: سێ برای دەبەنگ و گەلحۆ هەبوون، خاوەنی پارەو پولێکی زۆر بوون، ماڵەکانیشیان بە تەنیشت یەکەوە بوو، هەموو دەمەو ئێوارانێک لە ناو باخچەی بەر ماڵەکانی خۆیان دادەنیشتن، هەر کەسێک بەو گوزەردا بهاتایەو بڕۆیشتایە دەیانبینی.

کابرایەکی دەستبڕ نەخشەی کێشا بۆ ئەوەی گزی و فێڵێکیان لێ بکات، ڕۆژێک بە سواری ماکەرێکەوە بەبەردەم ماڵی یەکەمیاندا تێپەڕی، دوو لیرەی ئاڵتونی خستبووە ناو پاشەڵی ماکەرەکەوە، کە گەیشتە بەرامبەری ماڵیان کێشای بە سمتی گوێدرێژەکەداو لیرەی یەکەم کەوتەخوارەوە، هەڵیگرتەوەو خاوێنی کردەوە، پاشان دەستی بەرز کردەوەو گەلێک سوپاس و ستایشی خوای کرد، وەک ئەوەی گوێدرێژەکەی لە جۆری تایبەت بێت و لە جیاتی تەرس لیرە دەربدات، بۆ جاری دووەم کێشایەوە بە سمتی گوێدرێژەکەداو لیرەیدووەمیشی لێ کەوتە خوارەوە، دیسانەوە هەڵیگرتەوەو پاکی کردەوەو دەستی کردەوە بە سوپاس و ستایش کردنی خوا.

لە بەرامبەر ماڵی برای دووەم و سێیەمیشدا هەمان کاری دووبارە کردەوە!

لە دوای بینینی ئەم دیمەنە سەرنج ڕاکێشە هەر سێ براکە کۆبونەوەو بڕیاریاندا بە هەر نرخێک بووە ئەو گوێدرێژە بکڕن، ماڵی خاوەنی گوێدرێژەکەیان دۆزییەوەو داوایان لێ کرد ئەو گوێدرێژەیان پێ بفرۆشێت، بەڵام ئەو خۆی گیر کردو وتی: ئەمە گوێدرێژ نیە بەڵکو خەزنەیەکەو خودا بە منی داوە، لە جیاتی تەرس لیرە بەردەداتەوە، چۆن وا بە ئاسانی لە دەستی خۆمی دەکەمەوە؟

ئەمان هەر پێداگرییان دەکردو نرخی زیاتریان دەدا، ئەویش تا دەهات سەختگیرتر دەبوو، تا دواجار بە نرخێکی زۆر گران قایلیان کردو گوێدرێژەکەیان لێ کڕی و دایانلەبەر بۆ ماڵەوە.

هەر لە سەرەتاوە لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە گوێدرێژەکە هەر ڕۆژەو لەلای یەکێکیان بێت، یەکەمیان گوێدرێژەکەی وەرگرت و بردییەوە بۆ ماڵەوەو خزمەتێکی زۆر باشی کرد، پاشان دەستی کرد بە لێدانی، چاوەڕوان بوو لە جیاتی تەرس لیرەی بۆ بەربداتەوە کەچی چاوی بە هیچ نەکەوت، ئەوڕۆژەهەتائێوارە هێندەی لێدا تا وای لێهات گوێدرێژەکە خۆی بە پێوە ڕانەدەگرت.

بۆ سبەینێ گوێدرێژەکەی ڕادەستی براکەی تری کرد، ئەمیش دەستی کرد بە لێدانی هەتابڕستی لە خۆی و گوێدرێژەکەش بڕی.

برای سێیەمیش وەریگرت و هاوشێوەی براکانی تری لیرەی بە دووچاو نەدی.

پاشان بۆیان دەرکەوت فریو دراون، بۆیە بەهەڵەداوان چوونەوە بۆ ماڵی کابرای تەڵەکەباز بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆیانی لێبکەنەوە.

کە خۆیان کرد بەژوردا یەکسەرهات بەدەمیانەوەو بەگەرمی بەخێری هێنان و پێی وتن: ئێوە میوانی منن، هەتا تۆزێک هێور نەبنەوەو نانی ئەم نیوەڕۆیە پێکەوە نەخۆین هیچ قسەو باسێکتان لەگەڵدا ناکەم، دواتر هەرچییەکتان ویست بێ دڵیتان ناکەم.

داینیشاندن و کابرا کەروێشکێکی هێناو لە پەنای خۆیەوە داینا، کاخەزێکیشی دەرهێناو لە سەری نوسی:

نیو کیلۆ گۆشت، کیلۆیەک برنج، سەوزەو میوە.

پاشان قولینەیەکی هێناو کردییە ملی کەروێشکەکەو کاخەزو پارەی شتومەکەکانیشی خستە ناوییەوەو بەکەروێشکەکەی وت: هەر ئێستا بچۆ لە بازاڕ ئەم پێداویستیانە بکڕەو زوو بگەڕێرەوە، دەرگای ژورەکەی واز کردو کەروێشکەکەی کردە دەرەوە، دایکیشی بەدزییەوە کەروێشکەکەی گرت و لە

گۆڕیچەی خانوەکەدا شاردییەوە، خۆی چوو بۆ بازاڕو هەموو پێداویستییەکانی کڕی و هێنایەوە، کەروێشکەکەی لە گۆڕێچەکە دەرهێنایەوەو قوڵینەکەی کردەوە ملی و لە دەرگاکەیداو خۆی ون کرد.

کابرای فێڵاوی دەرگاکەی کردەوە تەماشا ئەکات کەروێشکەکە لە بەردەم دەرگاکەدا وەستاوەو قوڵینەکەی لە ملدایەو هەموو پێداویستییەکانیشی لەگەڵ خۆیدا هێناوەتەوە، سێ برا دەبەنگەکە کە ئەم دیمەنەیان دی تەواو سەرسام بوون، چیرۆکی گوێدرێژەکەیان بەیەکجاری بیر چوویەوە، سرتوخورتی ئەوەیان بوو کەروێشکەکەی لێ بکڕن!

نرخێکی باشیان پێدا، بەڵام ئەو لە سەرەتاوە ملی بۆ فرۆشتن نەدا، جار لە دوای جار نرخیان بۆ زیاد کرد، تا دواجار بە نرخێکی زۆر خەیاڵی لێیان کڕی!

گەڕانەوە بۆماڵەوەو هەمویان لە سەر ئەو خاڵە ڕێککەوتن کە کەروێشکەکە هەر ڕۆژەو لە ماڵی یەکێکیاندا بێت بۆ ئەوەی ئیشوکاری بازاڕی پێ بسپێرن!

یەکەمیان کەروێشکەکەی هێناو قوڵینەیەکی کردە ملی و ناوی چەند پێداویستییەکی لەسەر کاخەزێک نوسی و خستیە ناو قوڵینەکەوەو وتی: ئادەی هەر ئێستا بچۆ بۆ بازاڕ ئەم پێداویستیانەم بۆ بکڕەو زوو بگەڕێرەوە، بەڵام ئەوەی نەدەبوو ڕوبدا ڕویدا، کەروێشکەکە لە شوێنی خۆیدا وەستاو جوڵەی لە خۆی بڕی، لەگەڵ دوو براکەی تریشیدا هەمان شت دووبارە بویەوە!

هەر سێکیان پێکەوە بڕیاریان هاتە سەر ئەوە بچن نەک هەر تۆڵەی کەروێشکەکە بەڵکو تۆڵەی گوێدرێژەکەیش لە کابرای تەفرەدەر بکەنەوە، لە ڕێگاداپیرەمێردێکی بەساڵاچویان بینی کە یەکتریان باش دەناسی، پرسیاری لێ کردن: ئەرێ بۆ کوێ ئەچن؟ ئەوانیش چیرۆکی خۆیان بۆ گێڕایەوە، پیرەمێردەکە وتی: ئەگەر تەفرەی یەکەم جارتان لە بەدخوی و بەد ڕەفتاری کابرا بوبێ ئەوا

تەفرەی دووەم جارتان لە گەلحۆیی و لاژگی خۆتانەوە بووە، بۆیە من وای بەباش دەزانم سەری خۆتا کز بکەن و بە بێدەنگی بگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە، ئەوانیش بەقسەیان کردو بەشوێنی خۆیاندا گەڕانەوە.

# " خەوبینین لە زستان و لە هاویندا "

دەگێڕنەوە: جارێک پیاوێک هات بۆ لای خەون لێکدەرەوەی بەناوبانگ ئیبن سیرین و پێی وت:

ئەی ئیمام لە خەونمدا لە فلان شوێن ئاگرێکم بینی.

ئیبن سیرینیش پێی وت: هەرچی زووە پاچ و بێل لەگەڵ خۆتدا هەڵبگرەو خۆت بگەیەنەرە شوێنەکەو هەڵیبدەرەوە!

کابرا بەخێرایی خۆی گەیاندە شوێنەکەو هەڵیدایەوە، گۆزەیەکی پڕ لە ئاڵتونی تیادا دۆزییەوە، دۆزینەوەی ئەو ئاڵتونە زۆرە گەلێک دڵخۆشی کرد، ئیتر ژیانی پڕ لە ناسۆرو کوڵەمەرگی کۆتایی پێ هات و ئاسۆیەکی گەشی بەڕودا کرایەوە.

ڕۆژان هات و ڕۆژان ڕۆیشت کابرا جارێکی تر خەونێکی هاوشێوەی بینیەوە، بەرز بونەوەی ئاگرێک لە شوێنێکی چۆڵەوانیدا.

کە خەبەری بوویەوە لە دڵی خۆیدا وتی: پێویست ناکات بچمەوە بۆ لای ئیبن سیرین، واتای خەونەکە لەلای خۆمە!

بە پاچ و بێڵەوە خۆی گەیاندە ئەو شوێنەی کە لە خەودا بینیبووی ئاگری لێ بەرز بووەتەوە، دەستی کرد بە هەڵکەندنی تەماشا ئەکات تەرمی پیاوێکی تێدا شاردراوەتەوە کە زۆر نیە کوژراوەو هێشتا خوێنی لێ دەچۆڕێ، کە ئەوەی بینی ترس و بیمێکی زۆری لێ نیشت، خەڵک بەسەریدا هاتن و تۆمەتباریان کرد بە کوشتنی کەسەکە، قۆڵبەستیان کردو بردیان بۆ لای قازی، ئەویش بڕیاریدا بیخەنە بەندینخانەوەو کات و ڕۆژی لە سێدارەدانیشی بۆ دیاری کرد، چونکە کەسی بکوژ دەبێت بکوژرێتەوە!

پێش جێبەجێ کردنی بڕیاری لە سێدارەدانەکە قازی پێی وت: هیچ حەزو خولیایەکت هەیە پێش مردنت بۆتی بێنینە دی!

وتی: تەنها ئیبن سیرینم دەوێ ببینم!

ئیبن سیرینیان بۆ هێناو تۆمەتبارەکە پێی وت: ئەی ئیمام رۆژێک هاتم بۆ لات بۆ ئەوەی خەونێکم بۆ لێک بدەیتەوە، خەوەکەش بینینی ئاگرێک بوو لە شوێنێکدا، تۆش وتت بچۆ شوێنی ئاگرەکە هەڵبدەرەوە، منیش چووم و شوێنەکەم هەڵدایەوەو گۆزەیەکی پڕ ئاڵتونم تێدا دۆزییەوە، پاش ماوەیەک خەونێکی تری هاوشێوەم دی، هەڵگیرسانی ئاگرێک لە شوێنێکی چۆڵەوانیدا، لە دڵی خۆمدا وتم پێویست ناکات بچمەوە بۆ لای ئیبن سیرین. خۆ ئەگەر بیشچمەوە هەر دەڵێ بچۆ شوێنەکە هەڵبدەرەوە، چووم شوێنەکەم هەڵدایەوە تەماشا ئەکەم تەرمێکیان تێدا حەشارداوە، لەو کاتەدا بەسەرمدا هاتن و تۆمەتباریان کردم بە کوشتنی. لە کاتێکدا نە ئەیناسم و نە ئەمناسێت.

ئیبن سیرین پێی وت: خەونەکەی یەکەمجارت لەوەرزی زستاندا دی، ئاگریش لە زستاندا هاودەمەو هەموو کەس هۆگریەتی و خۆی لێ نزیک دەکاتەوە. بەڵام خەونەکەی دووەم جارت لە وەرزی هاویندا دی، ئاگریش لە هاویندا بێزراوەو خەڵک لێی دوور دەکەوێتەوە. ئەگەر بهاتیتایە بۆ لام پێم دەوتیت نەکەیت نزیکی ئەو شوێنە ببیتەوە؛ چونکە ئاگرەکەی دەتسوتێنێت.

## " بۆ ئەوەی خەڵك سڵ لە چاكە و پیاوەتی نەكەنەوە "

دەگێڕنەوە: پاشایەک هەبوو زۆر هۆگرو خولیای ئەسپ و چارەویٚ بوو، هەر ئەسپێکی ڕەسەن و باریکەلەی بدیایە بەهەر نرخێک بوایە دەیکڕی، هەر چارەوێیەکی خێراو بەپلی بەرچاو بکەوتایە هەموو شتێکی لە پێناودا دەدا!

کوڕی پاشایەکی دراوسیٚ وڵاتی ئەسپێکی زۆر ڕەسەن و بیٚ وێنەی هەبوو، زۆری حەز دەکرد بەهەر نرخێک بووە پێی بفرۆشێت، بەڵام ئەو ڕەتی کردەوە بیفرۆشێت بە بیانوی ئەوەی پاشاکان ئەسپ نافرۆشن بەڵکو دەیکەن بەدیاری، نایشتوانێت بیکات بە دیاری؛ چونکە ئەم ئەسپە یادگاری دایکە جوانەمەرگەکەیەتی!

پاشا خەریک بوو شێت و هار دەبوو، هەموو داورودەستەکەی خۆی کۆکردەوەو ڕاوێژی پێکردن چۆن ئەو ئەسپە ڕەسەن و دەگمەنە بەدەست بێنێت، یەکێک لە هاوکارەکانی وتی: من بۆتی بەدەست دێنم!

پاشا وتی: ئەی ئەگەر نەتتوانی؟!

وتی: ئەگەر نەمتوانی خۆ گەردنم لەبەردەستتدایەو دەتوانی لە جەستەمی جیا بکەیتەوە!

پاشا گەلێک خۆشحاڵ بوو هەم بەوباوەڕە پتەوەی کابرا بەخۆی هەیبوو هەم بەو نەخشەو پلانەیش کە بۆ بەدەست هێنانی ئەسپەکە کێشابوی.

پیاوەکەی پاشا دەیزانی شازادە ڕۆژانە لە چ ڕێگایەکەوە دەچێت بۆ ڕاو کردن، لە نزیک ڕێگاکەوە خۆی مت کردو دەستی کرد بە چاودێری کردن، هەرچاوە چاوی ئەوەی بوو شازادە سەرهەڵبدات، زۆری نەبرد لە دوور ڕا بەخۆی و ئەسپە ڕەسەنەکەیەوە دەرکەوتن، ئەمیش بەپەلە چووە ناوەڕاستی ڕێگاکەو خۆی لیٚ درێژ کردو دەستی کرد بە تەپاوتلدان وەک ئەوەی ئێش و ئازارێکی زۆر تەنگی پێهەڵچنیبیٚ!

شازادە کەسێکی مەردو جوامێر بوو، کە ئەوەی بینی بەخێرایی لە سەر ئەسپەکەی دابەزی و بەهانای کابراوە چوو، بەرزی کردەوەو جامێک ئاوی کرد بەقوڕگیدا، پاشان هەڵیگرت و خستییە سەر ئەسپەکەی و بەدەستی خۆیشی جڵەوەکەی بۆ ڕاکێشا!

وتی: جەنابی شازادە نەنگی و شورەییە من سوار بم و تۆ پیادە بیت

شازادە وتی: تۆ نەخۆشیت، شورەیی ئەوەیە من سوار بم تۆ پیادە بیت.

کابرا وتی: دەی مادام تۆ هەر پێداگری دەکەیت لەسەر ئەوەی من سوار بم دەبێ جڵەوی ئەسپەکە بدەیتە دەستی خۆم، منێکی ڕەشۆکی کەی شایانی ئەوەم شازادەیەکی وەکو تۆ جڵەوی ئەسپم بۆ ڕابکێشێت، جڵەوەکەی لێ وەرگرت و خۆی بەسەر ئەسپەکەوە قیت کردەوەو پێیدا لە ئاوزەنگی و بۆی دەرچوو.

شازادە شوێنی کەوت و هاواری کرد: ڕاوەستە، ڕاوەستە، ڕاوەستە ........

نەڵێی ئەم ئەسپەم بە فێڵ لە شازادە ئەستاندووە، بەڵکو بڵێ لە زۆرانبازیدا لێم بردوەتەوە، نەوەک خەڵک دوای بیستنی چیرۆکەکە پشت لە چاکەو پیاوەتی بکەن!

ئەم وشانە وەک هەورە بروسکە تەزوی بە جەستەی کابرادا هێنا، شازادەی ژیرو دانا توانی لەوکاتە کەمەداو بەچەند وشەیەکی کورت ناخی کابرا بهەژێنێت و ئەو هەستەی لەلا دروست بکات کە چەند کەسێکی نامەردو بەدخووە، بۆیە لە سەر ئەسپەکە دابەزی و بەرەو ڕوی شازادە هات و چیرۆکی خۆی بۆ گێڕایەوە، پاشان داوای لێبوردنی لێ کرد، ئەویش هەر لەوێدا لێی خۆش بوو، ڕێگەیشیدا لە مەملەکەتەکەی باوکیدا بمێنێتەوە نەوەک پاشاکەی خۆی بەڵایەکی بەسەردا بێنێت.

## " هەستە خەڵاتی خۆت وەربگرە و هەڕۆ، بەڕاستی دڵت خۆش کردم "

دەگێڕنەوە: یەکێک لە فەرمانڕەواکان هاوژینەکەی کچێکی دەبێت، ئەمە زۆر پەست و خەمباری دەکات، ماوەیەک خۆی گۆشەگیر کردو تێکەڵی خەڵکی نەدەکرد، ئەو حەزی لێبوو خودا کوڕێکی پێبدات بۆ ئەوەی ناوی ئەو هەڵبگرێت و دوای خۆیشی جڵەوەی دەسەڵات بگرێتە دەست.

هەندێک لە هاوڕێکانی دڵخۆشیان کردو بیریان هێنایەوە ئەمە بڕیاری خوایە، هەیە خودا هەر کوڕی پێ ئەدا، هەیە هەر کچی پێئەدا، هەیە هەردوکیانی پێ ئەدا، هەشە هیچیانی پێ نادات، بەڵام ئەم قسانە هیچی لە خەم و دڵتەنگی ئەو کەم نەکردەوە.

پیاوێکی ناشیرین و ڕەزا قورس ئەم هەواڵە دەبیستێت، بڕیار ئەدات سەردانێکی فەرمانڕەوا بکات، دوای مۆڵەت خواستن چووە ژوورەوەو لە بەردەمی فەرمانڕوادا وەستاو پێی وت: قوربان ئەگەر خوا کوڕێکی ناشیرین و ڕەزا قورسی وەک منی پێ ببەخشیتایە چیت دەکرد؟!

فەرمانڕەوا دەستی کرد بە پێکەنین، پێکەنینێکی وا کە پێشتر شتی وای پێوە نەبینرابوو، دوای ئەوەی خەڵاتێکی شایستەی کرد پێی وت: ئیتر هەستە بچۆ بەڕێی خۆتەوە بەڕاستی دڵت خۆش کرم!

## " کێ ئەم کەرە فێر دەکات؟ "

دەگێڕنەوە: یەکێک لە پاشا گێل و دەبەنگەکان گوێدرێژێکی هەبوو، گەلێک پێی سەرسام بوو، خەڵاتێکی گەورەی دیاری کرد بوو بۆ هەر کەسێک بتوانێت لە ماوەی دەساڵدا گوێدرێژەکەی فێری نوسین و خوێندنەوە بکات! سەرباری ئەوەش بە درێژایی ئەو دە ساڵە موچەیەکی مانگانەی شایستەیش بۆ ئەو کەسە دەبڕێتەوە.

بەڵام پاشا مەرجێکی سەخت و دژواری دانابوو، ئەویش ئەوە بوو ئەگەر نەیتوانی لە ماوەی دیاریکراودا گوێدرێژەکە فێری نوسین و خوێندنەوە بکات و شکستی هێنا ئەوا ملی لە لاشەی جیا دەکاتەوە.

کوڕە گەنجێکی هەژار ئامادەیی خۆی بۆ بەجێگەیاندنی ئەو کارە دەربڕی، کەسوکارو هاوڕێکانی لۆمەو سەرزەنشتیان کرد: هەڵەی وا چۆن دەکەیت؟! چۆن دەچیتە ژێر باری وەها کارێکەوە کە ئەزانی بەرهەمی نابێت و دواتر ئەنجامەکەی بە کوشتنت کۆتایی پێدێت.

گەنجەکەش لە وەڵامدا پێی وتن: دە ساڵ تەمەنێکی دوورو درێژە ، لەو ماوەیەدا یەکێکمان هەر دەمرین یان پاشا، یان گوێدرێژەکە، یان من، بەم کارە دەتوانم بەدرێژایی ئەو چەند ساڵە دەستەبەری ژیانێکی خۆش بۆ خۆم بکەم.

# " نەزاکەتی پزیشکێك "

دەگێڕنەوە: ژنی یەکێک لە پاشاکان توشی نەخۆشییەکی دەگمەن دەبێت، پزیشگەکان سەریان لەبەر نەخۆشییەکەی شاژن دەرنەدەکردو دەستەوسان بوون لە ئاستیدا،

ڕۆژێک پزیشکێکی گیادەرمانی دای بەلای کۆشکی پاشادا، پاسەوانەکانی کۆشک باسی نەخۆشییەکەی شاژنیان بۆ کرد، ئەویش پێی وتن: مۆڵەتم بۆ وەربگرن با شاژن ببینم، پاسەوانەکان هەواڵی پزیشکەکەیان گەیاند بە پاشا، پاشاش پێی وتن: ڕێگەی بدەن با بێتە ژوورەوە، پزیشک نەما خۆی لە شاژندا تاقی نەکاتەوە ئەم پزیشکە نەبێت، با ئەمیش بێت خۆی تاقی بکاتەوە بزانین هیچی لەدەست دێت.

پاشاو پزیشکەکە پێکەوە چوون بۆ ئەو شوێنەی شاژنی لێ ڕاکشابوو، هەرکە بینی یەکسەر زانی نەخۆشییەکەی چیە؛ بۆیە داوای مۆڵەتی ڕۆژێکی لە پاشا کرد بۆ ئەوەی دەرمانەکەی بۆ سازو ئامادە بکات.

پزیشکەکە چوو بۆ دارستان، ڕوەکێکی بڕی کە خۆی دەیناسییەوە، هێنایەوە بۆ ماڵەوەو دەرمانەکەی لێ دروست کرد.

بۆ بەیانی پزیشکەکە هاتەوە بۆ کۆشک، لەگەڵ پاشادا چوون بۆ ژورەکەی شاژن، تۆزە تۆزە دەرمانەکەی بۆ بەکار هێنا تا هەموی تەواو بوو، زۆری نەبرد تەندروستی شاژن ڕوی لە باشی کرد، سات لە دوای سات باشتر دەبوو، تا بەتەواوی چاک بوویەوەو وەک جاری جارانی لێ هاتەوە!

پاشا گەلێک خۆشحاڵ بوو، بڕیاریدا خەڵاتێکی گەورەی پزیشکەکە بکات، پێ

وت:

هەر داوایەکت هەیە بیکە هەتا بۆتی جێبەجێ بکەم، هەروەک چۆن تۆ دڵی منت خۆش کرد دەمەوێت منیش دڵی تۆ خۆش بکەم.

پزیشکەکە وتی: جەنابی پاشا داوای من تەنها شوشەیەک گوڵاوە!

پاشا سەری سوڕما لەم داوا سادەو ساکارە، پرسیاری لێ کرد ئەرێ ئەم هەمووە شتە گەورەو گرانە هەیە بۆچی داوای ئەم شتە کەم نرخ و بێ بایەخە دەکەیت؟

پزیشکەکە وتی: دەمەوێت ئەو گوڵاوە ببەم و لەو ڕووەکەی بپرژێنم کە لە ڕێی ئەوەوە توانیم دڵی تۆ خۆش بکەم.

پاشا وەڵامەکەی زۆر لەلا دڵگیر بوو؛ بۆیە بڕیاریدا دەستبەرداری نەبێت و بیکاتە پزیشکی تایبەتی خۆی لە ناو کۆشکدا.

## " هارونە ڕەشید و ئەبو نەوواس "

ڕەگێڕنەوە: هارونە ڕەشید کەسێکی ڕۆح سوک و خۆش مەشرەب بوو، هەردەم حەزی لە گاڵتەو گەپ و قسەی خۆش و پێکەنیناوی بوو، بەینی لەگەڵ نوسەران و شاعیران و وێژەران گەلێک خۆش بوو، زۆر جار شەوانە تا درەنگانێک پێکەوە دادەنیشتن و بەقسەی خۆش و گێڕانەوەی سەرگوزەشتەی ڕابوردوو شەوگاریان بەڕێ دەکرد.

لە شەوێکی ساردو باراناویدا بەڵام گەرم و گوڕ لە قسەو باسی خۆشدا هەموان لە کۆشکەکەی خەلیفەدا کۆبوبونەوە، هارونە ڕەشید بە میوانەکانی وت: هەر کەس ئەمشەو هەتا بەیانی لە دەرەوەو لە ژێر پلوسکەکەدا بمێنێتەوە ئەوا هەزار دیناری خەڵات دەکەم.

ئەبو نەوواسی شاعیر وتی: من ئەو کارە دەکەم.

ئەبو نەوواس ئەو شەوە هەتا بەیانی لە ژێر پلوسکەکەدا ئاوی بەخوڕ بەسەریدا دەهاتە خوارەوەو سەرما هەڵیدەچۆقاند!

هارونە ڕەشید لای سەیر بوو ئەبوو نەوواس توانیویەنی بەرەگەی ئەو حاڵە سەخت و دژوارە بگرێت، بۆیە بانگی کردو پێی وت: ڕەنگە بە شتێک خۆتت گەرم کردبێتەوە.

ئەبو نەوواس وتی: بەخوا ئاگرم بە دووچاو نەدیوە، تەنها ئاگرێک نەبێت کە لەسەر لوتکەی شاخەکە کرابویەوە، ئەویش ڕەنگە شوانێک کردبێتییەوە!

هارونە ڕەشید وتی: دەی کەواتە بە تینی ئەو ئاگرە خۆتت گەرم کردووەتەوە، بۆیە هیچی پێنەدا.

ڕۆژان هات و ڕۆژان ڕۆیشت، جارێک ئەبو نەوواس بانگهێشتی هارونە ڕەشیدو دارودەستەکەی بۆ نیوەڕۆ خوانێک کرد.

ئەوانیش لە کاتی نیوەڕۆدا ئامادە بوون، چاوەڕوانی نان و خوانیان دەکرد بەڵام هیچ دیار نەبوو، پرسیاریان لە ئەبو نەوواس کرد کوا نان و خوان، مردین لە برسان؟ ئەویش وتی: جارێ چاوەڕوان بن، هەر جارێ پرسیاریان لێ دەکرد دەیوت لەسەر ئاگرەکەیەو هێشتا پێنەگەیشتووە.

چاوەڕوانی درێژەی کێشاو هارونە ڕەشید ئارامی لێ بڕا، بڕیاریدا بەخۆی بچێت تەماشایەکی ئەو ئاگرە بکات کە چەندێکە نەیتوانیوە ئەو شیوە بکوڵێنێت، چوو بۆ لای ئاگرەکە تەماشا ئەکات مەنجەڵەکەبە لقی دارێکەوە هەڵواسراوەو مۆمێکی لە ژێردا داگیرساوە!

هارونە ڕەشید کە ئەمەی بینی توشی شۆک بوو، بە ئەبوو نەوواسی وت: ئاگری ئەم مۆمە چۆن ئەم چێشتە دەکوڵێنێت؟!

ئەبوو نەوواسیش وتی: هەروەک چۆن ئاگری سەر شاخەکە منی گەرم کردەوە هەر ئاواش ئەم مۆمە چێشتەکە دەکوڵێنێت.

هارونە ڕەشیدە هێندە پێکەنی خەریک بوو لە هۆشی خۆی بچێت.

## " بۆچی؟ چونکە "

دەگێڕنەوە: لە سەردەمی عەبباسییەکاندا یەکێک لە کاربەدەستەکان جەورو ستەمێکی زۆی لە ژێردەستەکانی خۆی دەکرد، ئەرکی زۆر قورس و تاقەت پڕوکێنی بەسەریاندا ئەدا، مافی خۆیانی نەئەدانێ، خەڵکەکە تینیان بۆ هات و بڕیاریاندا بچن بۆ بەغدادو سکاڵای خۆیان بۆ لای خەلیفە بەرز بکەنەوە.

شاندێکیان پێکهێناو پیاوێکی ژیرو دانایان کردە دەمڕاست و سەردەستەی خۆیان، ڕۆیشتن تا گەیشتنە بەغداد، کە گەیشتنە لای خەلیفە سەردەستەکە هەستایەوەو بە خەلیفەی وت: بۆچی؟

خەلیفەش وتی: چونکە! ئیتر نە ئەم قسەو نە ئەو قسە.

سەردەستەکە لای کردەوە بەلای ئەوانەی لەگەڵیدا بوون و پێی وتن: هەستن با بچینە دەرەوە، وەڵامی خۆمان وەرگرت و دیدار کۆتایی هات.

شاندەکە سەریان لەم مەتەڵە دەرنەدەکرد، بۆیە داوایان لە سەردەستەکە کرد ئەو گفتوگۆیەی نێوان خۆی و خەلیفەیان بۆ شی بکاتەوە.

سەردەستەکە وتی: بە خەلیفەم وت: 'بۆچی' کاربەدەستەکانت ستەم و ناهەقیمان بەرامبەر دەکەن؟

خەلیفەش لە وەڵامدا وتی: 'چونکە' خۆتان هەر چۆن بن خودا فەرمانڕەوای بەوجۆرەتان بۆ دەنێرێت! دیارە خۆتان خراپن بۆیە کاربەدەستی خراپتان بووە بەتووشەوە!

## " هەڵسوکەوت و مامەڵەی هاوشێوە "

دەگێڕنەوە: کۆمەڵە جوتیارێک لە کێڵگەیەکدا هێلکەی مارێکیان دۆزییەوە، لە شوێنەکەی خۆی هەڵیان گرت و گواستیانەوە بۆ شوێنێکی تر، لە دوورەوە چاودێریان دەکرد تا بزانن کاردانەوەی مارەکە چی دەبێت!

مارەکە گەڕایەوە تەماشا ئەکات هێلکەکەی لە شوێنی خۆیدا نەماوە، بەخێرایی چوو بۆ لای ئەو مەرکانە ئاوەی کە جوتیارەکان ئاویان لێ دەخواردەوە ژەهر ڕێژی کرد.

جوتیارەکان هێلکەکەیان بردەوە بۆ شوێنی خۆی، لە دوورەوە چاودێرییان کرد تا بزانن ئەمجارە کاردانەوەی مارەکە چۆن دەبێت.

کاتێک مارەکە گەڕایەوەو بینی هێلکەکە هاتووەتەوە بۆ شوێنی خۆی یەکسەر بەرەو لای مەرکانەکە کشاو خۆی لێ ئاڵاندو ڕایوەشان هەتا قلْپی کردەوەو ئاوە ژەهراوییەکەی ڕژاندە سەر زەوی!

## " ئەگەر پارەت هەبوو هەموو شتێك هەرزانە "

دەگێڕنەوە: باوکێک هاوڕێ لەگەڵ کوڕەکەیدا دەچێت بۆ سەردانی دۆستێکی ئازیزی، لە ڕێگای بازاڕەوە ڕۆیشتن، گوێیان لە کابرایەک بوو هاواری دەکرد: ئەم وشترە بە درهەمێک!

کوڕەکە وتی: باوکە گیان ئەو وشترەمان بۆ بکڕە زۆر هەرزانە

باوکی وتی: نەخێر ڕۆڵە گیان زۆر گرانە.

ڕۆژان هات و ڕۆژان ڕۆیشت کوڕو باوکەکە پێکەوە بەلای بازاڕدا تێپەڕینەوە، کابرایەک هاواری دەکرد ئەم وشترە بە سەد درهەم!

باوکەکە چوو بۆ لای کابراو سەد درهەمەکەی خستە مشتی و وشترەکەی لێ وەرگرت و دایەبەر.

کوڕەکە وتی: باوکە گیان ساڵی پار داوام لێکردیت وشترێک بکڕیت کە نرخەکەی تەنها یەک درهەم بوو لە وەڵامدا پێتگوتم گرانە، ئەوەتا ئەمڕۆ سەد دیرهەم لە نرخیدا دەدەیت و پێیشت وایە هەرزانە!

باوکەکە زەردەخەنەیەکی کردو وتی: ڕۆڵە کام نرخە کەمە بۆ کەسێ کە نەیبێ زۆرە، کام نرخە زۆرە بۆ کەسێ کە هەیبێ کەمە، ساڵی پار من خاوەنی تاقە درهەمێک نەبووم، ئەگەر هەموو سەرزەویشیان پێبفرۆشتمایە بە دیرهەمێک نەمدەتوانی بیکڕم؛ چونکە نەمبوو، بەڵام ئەمساڵ خودا دەروی خێری لێ کردمەوە، ئەم سەد درهەمەی کەئەم وشترەم پێ کڕی زۆر کەمترە لەو یەک درهەمەی کە ساڵی پار پێم نەبوو.

# " پارەو سامانی حاجیان "

دەگێڕنەوە: کۆمەڵێک کەس بە مەبەستی حەج کردن لەڕێگەی دەریاو بە سواری کەشتی بەرەو شاری مەککەی پیرۆز کەوتنە ڕێ، لە ناو کەشتییەکەدا مەیمونێکی هارو بزێو هەبوو، شوێنی بەخۆی نەدەگرت، تاوێ لەگەڵ سەرنشینەکاندا یاری دەکرد تاوێک دەچووە سەر ستون و کۆڵەکەکانی کەشتییەکە.

حاجییەکان جزدانی پارەو شتومەکەکانیان لەلای کەشتیوانەکە بە ئەمانەت دانا بوو، مەیمونەکە چوو هەموو جزدانەکانی لە کەشتییەوانەکە دزی و سەرکەوتە سەر ستونی کەشتییەکە، یەکەکە جزدانەکانی دەکردەوەو پارەکانی دەردەهێناو هەندێکی فڕێدەدایە ناو دەریاکەو هەندێکی تریشی فڕێدەدایە ناو کەشتییەکە!

پیاوێکی زەریف لە ناو کەشتییەکەدا بوو وتی: خودا خۆی پاکەو تەنها پاکیش وەردەگرێت، سوێند بە خوا ئەم مەیمونە پارەی حەڵاڵ و پارەی حەرام لە یەکتری جیادەکاتەوە، ئەوەی حەڵاڵە بۆ ناو کەشتییەکەو ئەوەیشی حەرامە بۆ ناودەریاکە!

## " پارێزەر و کوڕە لادێییەکە "

دەگێڕنەوە: کوڕە لادێییەک بۆ کڕینی هەندێک لە پێداویستییەکانی بۆ یەکەم جار ڕوو لە شار دەکات، لەوێ کوڕە شارییەک تۆمەتی ئەنجامدانی تاوانێکی دەداتە پاڵ کە لێی بێ خەبەر بوو، قۆڵبەستیان کردوو بردیان بۆ دادگا، کوڕە لادێییەکە یەکەمجاری بوو بێتە ناو شارەوەو دادگاشی هەرگیز نەدیبوو.

دادگایی کردن دەستی پێ کرد، کوڕە شارییەکە پارێزەرێکی گرتبوو هەر خول و سوڕی بوو بەدەوریدا، بەرگری لێ دەکردو کوڕە لادێیەکەی تۆمەتبار دەکرد، کوڕە لادێییەکەش قۆڵی بەسترا بوو، دۆش داما بوو نەیدەزانی چی بکات، بە قازییەکەی وت: جەنابی قازی سوێند بەخوا ئەم شایەتە نە لەوێ بووەو نە هیچیشی دیوە.

دوایی بۆی دەرکەوت ئەم کابرا شایەت نیە بەڵکو پارێزەرە!

کوڕە لادێییەکە بە قازییەکەی وت: داوا لە جەنابی قازی دەکەم دانیشتنەکە دوابخات هەتا منیش ئەچم درۆزنێکی وەک ئەم درۆزنە پەیدا دەکەم!

## " گوێدرێژ ماسییە "

دەگێڕنەوە: جارێک گوێدرێژێک بە شیوەن و گریانەوە سکاڵای خۆی بۆ لای شێر دەبات و پێی دەڵێت:

ئەی پاشای دارستان هاتوم سکاڵای خۆم لە جەورو ستەمی مرۆڤ و گیانلەبەرانی تر لە لای تۆ بکەم، کەس ڕێزم ناگرێت، هەمویان بە گوێدرێژ بانگم دەکەن!

شێر وتی: من چی بکەم؟ تۆ خۆت ناوت گوێدرێژەو هەر بەو ناوەشەوە دەناسرێیتەوە، ئیتر ئاوایە هەر گیانلەبەرێک و ناوێکی تایبەت بە خۆی هەیە.

گوێدرێژ وتی: پاشای دارستان ئەمەوێت ناوەکەم بگۆڕێت.

شێر وتی: چ ناوێکت لێ بنێم؟

گوێدرێژ وتی: هەر ناوێکم لێ دەنێیت لێم بنێ تەنها ناوی گوێدرێژ نەبێت!

شێر وتی: ناوت دەنێم ماسی، پێت باشە؟

گوێدرێژ بەم ناوە نوێیە گەلێک خۆشحاڵ بوو، دەستی کرد بە گەڕان بە ناو دارستانداو بگەیشتایە بەهەر گیانلەبەرێک پێی دەوت: لەمڕۆ بەدواوە ئیتر من ناوم گوێدرێژ نیە.

بەژێر درەختێکدا تێپەڕی و پەپوسلێمانە لە سەرەوە بانگی کرد: هۆ گوێدرێژ

گوێدرێژ وتی: ئەی بۆ نازانیت لەمڕۆ بەدواوە ئیتر من گوێدرێژ نیم و ناوم ماسییە!

پەپوسلێمانە وتی: مەلەوانی دەزانیت؟

گوێدرێژەکە وتی: نەخێر

پەپوسلێمانە وتی: دەی بەخوا ببیت بە ڕاوێژکاریش هەر گوێدرێژیت.